# Santiago De Compostela

رۆمان

# سانتیاگۆ دی کۆمپۆستێلا

## فەرهاد پیربالّ



ناوی کتێب: Santiago De Compostela سانتیاگۆ دی کۆمپۆستێلا – ڕۆمان
نووسینی: فەرهاد پیربالّ
بلاّوکراوەی ئاراس– ژمارە: ١١٩
دەرهێنانی هونەری: بەدران ئەحمەد حەبیب
بەرگ: شکار عەفان نەقشبەندی
نووسینی سەر بەرگ: محەمەد زادە
تیرێژ: ١٦٠٠ دانە
سەرپەرشتیی کاری چاپخانە: ئاوڕەحمان مەحمود
چاپی یەکەم – چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر– ٢٠٠٢
لە کتێبخانەی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ڕۆشنبیری و هونەر لە هەولێر ژمارە (٣٨)ی ساڵی ٢٠٠٢ی دراوەتێ

پێشکەشە بە « **تەرزە**» ،
بەو ماڵەی کە بووە نیشتیمانێکی
ڕزگارکراوی بچکۆڵە بۆ خۆم...

## 1

لە تولووز، تەنیا چارەگە سەعاتێک بوو لە شەمەندەفەر دابەزیبووم، هەستم بەبرسێتی و هیلاکی دەکرد. لە نزیک وێستگای شەمەندەفەر چاوم بە دەوروبەری خۆمدا دەگێڕا بۆ ئەوەی چێشتخانەیەکی خۆش بدۆزمەوە و بچم نانێک بخۆم. لە کۆتاییدا چووم لە دالآنی بەرسێبەری چێشتخانەیەک لەسەر کورسیەک دانیشتم.

هەر کە دانیشتم و دانەنیشتم، قولەڕەشێک هات لە بەردەمم ڕاوەستا. جانتایەکی گەورەی ڕەشی پێ بوو، لەسەر مێزەکەی بەردەمم کردییەوە. من کە جارێ داوای هیچ خواردنێکم نەکردبوو، وامزانی ئەو قولەڕەشە گارسۆنە و خواردنی بۆ هێناوم؛ بەڵام کە چاوم بە ناوەوەی جانتا کراوەکەی کەوت (پڕ بوو لە ئەنگوستیلە و سەعات و گوارە و ددانە فیل و ملوانکەی زیوین)، یەکسەر تێ گەیشتم!

قولەڕەش بە زمانێکی فەڕەنسیی ئەوتۆ کە دیار بوو لە باکووری ئەفریقاوە فێری ببوو، زەردەخەنەیەکی بۆ کردم:

– مسیۆ، ناتەوێ دیارییەکی جوان بۆ خۆشەویستەکەت ببەیتەوە؟

بە هەناسەساردی و هیلاکییەوە، گوتم:

– نا، سوپاس.

قولەڕەش لە من دوورکەوتەوە، چوو هەمان شتی لەگەڵ پیاوە سەر ڕووتاوەکەی نزیک من دووبارە کردەوە. منیش، پشتم بە کورسییەکە دابوو، بە پشتە دەستم بە هێواشی عارەقەی نێچەوانم سڕییەوە و هەناسەیەکی قووڵی حەسانەوەم هەڵکێشا.

من پێش ئەوەی سەری خۆم هەڵگرم و بە وڵاتان کەوم، لە دەربەدەری زۆر دەترسام، دەترسام تەبای ئەم قولە ڕەشە، سنووقێکی پڕ لە سەعات و گوارە و ددانە فیل و ملوانکە بە ملمەوە بکەم و لە شەقامەکانی ئەوروپادا بسووڕێمەوە، یان بچم لە چێشتخانەکاندا بەشەو کار بکەم، یان لەناو میترۆکاندا دانیشم ڕۆژنامە بفرۆشم، تەنیا بۆ ئەوەی هەندێ پارەم دەست بکەوێت و لە دوورەوڵاتیدا مەمرە و مەژی پێی بژیم.

نەریمان بۆی دەگێڕامەوە، دەیگوت کە لە بەهاری ساڵی ١٩٨٢، دوای ئەوەی سنووری نێوان عیراق و تورکیای بە قاچاغ بڕیوە و گەیشتۆتە ئەستەمبۆڵ، لەوێ، بێ ئەوەی هیچ کەسێک بناسێ، کاتێ پارەی لێ بڕاوە، چۆن هەموو ڕۆژێک، سەر لە بەیانیان زوو، لە گەڕەکی دیوانلی لە ئەستەمبۆڵ، چووە ڕیزەی گرتووە: دوو دەستە بلیتی پاصی کڕیوە و لە بەردەرگای وێستگەی شەمەندەفەرەکاندا، یان لە بەردەم نوقتەی وەستانی پاصەکاندا، ئەو بلیتانەی تەنیا بە لیرەیەک قازانج فرۆشتۆتەوە «کە ئەو لیرەیە ناکاتە تەنانەت نرخی یەک جگەرەش!» و چۆن لە ئەستەمبۆڵ تەنیا پڕوپیرەژن و ئافرەتە میهرەبانەکان سکیان پێ سووتاوە و ئەو بلیتانەیان لێ کڕیوە!





نەریمان دەردێکی کوشندەی بەدەست بێ پارەیی و برسێتییەوە لە ئەستەمبۆڵ دیبوو، هەموو جار دەیگوت: «تورک زۆر بێ ئینسافن». حەمەزیادیش بە هەمان شێوە: هەتا لە دیمەشق بووە هەر بە کرێکاری و ئیشی قوڕکاری ژیاوە، کە گەیشتۆتە ئیتاڵیاش بۆ ماوەی سێ هەفتە لە شاری ڤینیس لە پۆلیس ڕایانگرتووە و دەیان سەراو و دەراویان پێ کردووە، ئنجا لەوێشەوە – لەبەر ئەوەی ڤیزەی میسر بە پەساپۆرتەکەیەوە هەبووە – گەڕاندوویانەتەوە میسر؛ لەکۆتاییشدا، هەر لەوێ، لە قاهیرە «لە ڕێگەی پیاوێکەوە کە بە ڕێککەوت باب و باپیرانی کوردی دیاربەکر بوونە و لە بەڕێوەبەرایەتیی کاروباری سەفەرکردنی بێگاناندا کاری کردووە و بەزەیی بە حاڵی حەمەزیاددا هاتۆتەوە» توانیویەتی بگاتە میوونخ؛ ئیتر لەو ڕۆژەشەوە تاکو ئێستا لە گوندێکی نزیک شاری میوونخ گیرساوەتەوە و لەوێ، لەگەڵ چەندین پەناهەندەی دیکەی کورد و (٢) لبنانی و (٣) سریلانکی، هەموو بەیانییەک، نان و پەنیریان دەرخوارد دەدەن و دوای ئەوەش ئیتر هەر لە بەیانییەوە تا پاش نیوەڕۆ – ناو میترۆ و گۆڕستانەکانیان پێ پاک دەکەنەوە. خۆ سەرداریش لە ئەمستردام بە هەمان شێوە، هەر کار دەکات و لە نامەکانیدا هەمیشە دەنووسێ، دەڵێ:

– گەواد، من پارەی تەیارەم نییە، دە تۆ وەرە سەرێکم لێ بدە!

لەوە دەچێ لە ڕیزی هاوڕێ ئاوارەکانم، تەنیا من لەم بارەیەوە کەمێک بەختەوەر بم: لە دوورە وڵاتی و ئاوارەیی خۆمدا، وەک ئەوان و بەقەد ئەوان، دەردی بێ پارەیی و برسێتیم لە ئەورووپا نەچێشتووە: تەنیا حەوت مانگ لە ئۆردووگای پەناهەندانی شاری ئۆسلۆ مامەوە؛ ئیتر لە ئۆسلۆ کە مافی پەناهەندەییم بۆ دەرچوو، یەکسەر – باشیشم کرد – چوومە ژنێف، لەوێشەوە بە قاچاغ سنورم بڕی و هاتم بۆ پاریس، بۆ (مۆنماخت)؛ بۆ مۆنماختی پەلکەزێڕینەی ڕەنگ و تابلۆ و پۆرترێت، مۆنماختی فریاگەری دەردی برسێتی و بێ پارەیی؛ ئەو مۆنماختەی تەنیا پێنج سەعات کارکردنی یەک ڕۆژ، پێنج صەد دۆلارم پێ دەبەخشێ! باشیشم کرد. ئا. باش بوو ئەو جەربەزەییەم کرد.

لە دالآنی بەرسێبەری چێشتخانەکەدا تەماشای قولەڕەشەکەم دەکرد: بەردەوام دەسووڕایەوە و جانتا ڕەشەکەی، یەک یەک لە بەردەم دانیشتووەکاندا دەکردەوە، بەڵام بێ ئەوەی کەس هیچی لێ بکڕێ، ڕووی دەکردە لای مێزێکی دیکە.

من لەو دەمەدا غەمی غوربەت و هەستی پڕ سوێی بێ وڵاتیی خۆم بەوە دەڕەواندەوە کە من هەر هیچ نەبێ – وەک ئەم قولەڕەشە – هێندە ئازاری گەڕان و سووڕان و ماندووبوون ناچێژم: ئەو ئەگەر لە ماوەی هەفتەیەکی ڕەبەقدا، دوای گەڕان و ڕاکەڕاکەیەکی زۆر، تەنیا سێ صەد فڕەنکی دەست بکەوێ، ئەوا من ئەم سێ صەد فڕەنکەم بە ئارامییەوە لە ماوەی تەنیا دروستکردنی تابلۆیەکدا دەست دەکەوێ.

– جیاوازیی من لەگەڵ ئەودا چییە؟

– تەنیا ئەوەیە کە تۆ بەهرەی ڕەسمکردنت هەیە، بەڵام ئەو ئەم بەهرەیەی تۆی نییە.

– وا نییە.

– چۆن؟

– چەند کەسی دیکە بەهرەی ڕەسمکردنیشیان هەیە و لەناو میترۆکاندا سواڵ دەکەن؟

– کەواتە..

– مەسەلەکە پەیوەندیی بە توانای جەربەزەیی و خواستێکی سەرکێشانەیشەوە هەیە لەلای مرۆڤدا.

– تۆ لە بیرتە؟

–چی؟

– وتت کە ئەو وەختەی لە ژنێف بووی، بە دروستکردنی کاریکاتێر دەستت پێ کردووە.

– لە نیگارکێشە پەناهەندە یۆنانییەکانەوە فێری «ئەم جۆرە کاسبییە» بووم.

– لە ئەورووپا، لە زۆربەی پایتەختەکاندا، ئەوانەی تەنانەت یەک تۆزقاڵیش دەستی ڕەسمکردنیان هەیە، ڕوودەکەنە ئەم هونەرە.

– بەتایبەت لە قەراغ ڕووبار و دەریاکاندا..

– بەڵێ، دەزانم: ستاندێک دادەنێن و کاریکاتێر..

– لەم جۆرە شوێنانە تووریستەکان زیاتر وەک خێرێک دەسهەقی کاریکاتێرەکانمان دەدەنێ.

لە کۆتاییی ئەم گفتوگۆیەدا «ڤینۆس» کە دیار بوو دەیویست هانم بدات و دڵم بداتەوە، گوتی:

– هەر چۆنێک بێ، ئەم هونەرەی کە تۆ ناوی دەنێیی «کاسبی» هەرگیز وەک دەرۆزەکردن تەماشای نەکراوە!

جگەرەیەکم داگیرساند و کەوتمە بیرکردنەوەی زەمانی منداڵیم. حەزم دەکرد وەبیر خۆمی بهێنمەوە: لە سەرەتادا چۆن دەستم کردە نیگارکێشان؟ چۆن خووم دایە ئەم هونەرە! کەی بوو؟

لەو دەمەدا یەکسەر سەر و قژی بە ڕۆن بریقاوەی مامۆستای وانەی رەسمم هاتەوە بەرچاو. ئەرێ ناوی چی بوو؟ ئا. ناجی – ناجییە فەندی! لە قوتابخانەی ناوەندیی هەڵەبجە، هەموو سێ شەممەیەک، پاش نیوەڕۆ، کاتژمێر سێ و نیو، کاتێ دەهاتە پۆلەکەوە، یەکسەر بۆنی عارەقی زەحلاوی بڵاو دەبۆوە. ناجییە فەندی لەناو پۆلەکەدا، بێ ئەوەی سەیری هیچ قوتابییەک بکا، یەک دوو جار، بە درێژی و پانیی پۆلەکە





هاتوچۆی دەکرد، ئنجا دەچوو بە تەباشیر شتێکی لەسەر تەختە ڕەشەکە دەنووسی و بە دەنگێکی کەرخ، وەک ئەوەی شتێک لە کۆڵ خۆی بکاتەوە، دەیگوت:

– ڕەسمێک بە ئارەزووی خۆتان بکەن!

ئیتر ئێمەش، قوتابیەکان، پێنووس و دەفتەری رەسممان دەردەهێنا و دەکەوتینە نیگارکێشان. هێندەی پێ نەدەچوو، ناجییە فەندی دوای یەک دوو جار هاتوچۆکردن بەناو پۆلەکەدا داوای لە «تەها لووتە»ی چاودێری پۆلەکەمان دەکرد بۆ ئەوەی بێت، لە جیاتی ئەو، لە بەردەم تەختەڕەشەکە ڕابوەستێ. ئیتر ناجییە فەندی بۆ خۆیشی، دەچووە دەرەوە و تا دوایین دەقیقەکانی هەمان وانە نەدەگەڕایەوە. قوتابییەکان، هەموومان، دەمانزانی کە ناجییە فەندی ئیتر لەم ماوەیەدا لە ژووری مەرسەم، کە بۆ ئەو بریتی بوو لە ژووری عارەقخواردنەوە، وا خەریکی عارەق خواردنەوەیە!

گوڵنۆش!

گوڵنۆشی میهرەبان، گوڵنۆشی گوڵە نەخشە ڕەنگاورەنگ جوانەکانی سەر بەرگەبالیف و پەردە و چەرچەفەکان، گوڵنۆشی خوشکم! تاقە کەسێک بوو کە لەو ڕۆژگارە دوورەدەستەی ئەوسای هەرزەکاریمدا نیگارەکانی منی خۆش دەویست. هەموو جار دەهات لاپەڕەکانی دەفتەری ڕەسمەکەمی یەک یەک هەڵدەدایەوە و کونجکۆڵانە لە نیگارەکانم ورد دەبۆوە:

– ئا دەی بزانم چ وێنەیەکی تازەت کردووە!

جارێکیان نیگارێکی ئەوم قۆپیە کردبوو، کە ئەو پێشتر لەسەر پەردەی پەنجەرەیەکی ماڵەوەمان، لەسەر پەڕۆیەکی جاوی سپی بە دانتێل و داوی رەنگینی بریقاوە چنیبووی: وێنەی سوارێک بوو، بە ڕانک وچۆغەی کوردی و کڵاوێکی پەڕدارەوە، لەسەر ئەسپێک، تاژییەکی ڕەپێش خۆی دابوو، بۆ ڕاو دەچوو. گوڵنۆش کە نیگارەکەی منی بینی، بێ ئەوەی دڵی بێ تەریقم بکاتەوە، بە سەرسوڕمانێکی کەیفخۆشییەوە، بەسەر دەفتەری رەسمەکەمدا نوشتایەوە:

– ئای، شەیتان! ئەم وێنەیەت لە ئەوەکەی من زۆرە جوانترە!

واتێ دەگەم ئیتر هەر لەو ڕۆژەوە بوو کە ئاشنایەتیی «تایبەتی» نێوانمان دەستی پێ کرد: هەموو هەفتەی جارێک، بەردەوام، دەهات دەیگوت:

– وەیش! ئەوە بۆ پێم ناڵێیت کە لاپەڕەکانی دەفتەری ڕەسمەکەت تەواو بووە؟

دەچوو جانتا چکۆڵانە ڕەشەکەی خۆی لەناو قەدی نوێنەکانی ژوورە بچکۆڵەکەمان دەردەهێنا، «ڕوبعێک» یا چەند درهەمێکی دەدامێ، دەیگوت:

– هانێ، بچۆ پەڕاوێکی تازە بۆ خۆت بکڕە!

گوڵنۆشی میهرەبان! چ ساڵێک بوو، نازانم! کاتێ شووی کرد، ئیتر گوڵنەخش و

نیگاری سەر بەرگە بالیف و پەردە و چەرچەفەکانیش لە ماڵەکەمان کۆتاییان پێ هات. قەڵەمڕەنگ و تابلۆ و لاپەڕە ڕەنگاوڕەنگەکانی منیش، تەنیا مانەوە. هەرچۆنێ بێ، وا تێ دەگەم هەر لە سۆنگەی ئەو یادگارە شیرینانەی ڕۆژگاری جارانمان بوو، کە لە سەرەتای بەهاری ساڵی ١٩٨٢دا، کاتێ من خەریک بووم سەری خۆم هەڵدەگرت و بە یەکجاری ماڵم بەجێ هێشت؛ لە ڕۆژی ماڵئاواییمدا، پێنج صەد دۆلاری کاشی لە دەست نام، گوتی:

– هانێ دارا، ئەم پێنج صەد دۆلارەم لێ وەربگرە.

من سەیری پێنج صەد دۆلارە غەمگینەکەی ناو دەستی خۆمم دەکرد و خەریک بوو بگریم، ئەو گوتی:

– هەڵی گرە، دارا، نەوەک لە هەندەران، لە وڵاتی غەریبیدا بۆ فلچەیەک یان بۆ قەلەمڕەنگێک دەست لە ئەم و ئەو پان بکەیتەوە.

من لەو دەمەدا هەستێکی سوگواریی قووڵ، لەتاو ئەوەی کە چەند ساتێکی دیکە دەڕۆیشتم (گوڵنۆش و دایکم و دەزگیرانەکەشم، هەموو ئاشنا و خۆشەویستێکی دیکەشمم بەجێ دەهێشت ) تەبای دەستێکی ژەهراوی، چڕنووکی لە ڕۆحم گیر کردبوو. قوڵپی گریانێکی بە سۆز لە سینەمدا پەنگی دەخواردەوە.

من تەنیا دوو ڕێگام لە بەردەم مابوو: یا دەبووایە جلوبەرگی سەربازی لەبەر بکەم و بچم بۆ جەنگ و، ببم بە ئامێرێکی دەست دکتاتۆریەتی حزبی بەعس؛ یانیش دەبووایە سەری خۆم هەڵگرم و بە وڵاتان کەوم.

ئەوکاتە، جارێ هێشتا حزبی بەعس دەستی نەکردبووە ئەنفال کردن، بەڵام تازە پیاوی خێزان و ماڵە بارزانییەکانی گواستبۆوە و بێ سەروشوێنی کردبوون. پیاوی بەتەمەنی وەک باوکمی پێ چاوترسێن کردبوو، بەتایبەتیش لەو ماوەیەدا کە تازە – تەنیا چەند هەفتەیەک بوو – مەیتی سەمیری کوڕی مامم لە قادسیەی صەدامەوە گەڕابۆوە هەڵەبجە: مەیتی سەمیر، بێ لەسەرنووسینی هیچ ناونیشانێک، لە بەردەم مزگەوتی گەورەی هەڵەبجە، لەناو دارەمەیتێکدا فڕێ درابوو، لەسەری نووسرابوو «استشهد فی دیزفول». هەر لەو ماوەیەشدا، ڕۆژێکیان حزبی بەعس حەوت گەنجی فیراری جەنگی لە ناوەڕاستی مەیدانی ناوشار لە حەوت کۆڵەگەدا بەستبۆوە و گوللەبارانی کردبوون بۆ ئەوەی گەنجی دیکە چاوترسێن بن و چیتر لە خزمەتی سەربازی ڕانەکەن. ئەو ئێوارەیە باوکم بەشڵەژاوی هاتە ماڵەوە و دەستی کردە قەناعەت پێ هێنانم. باوکم گوتی:

– کوڕم، ئاخر، تۆ زانکۆت تەواوکردووە...

– ئێ!؟

– ناچیتە عەسکەری؟





– بچم عەسکەری بێ تاوانی ئێرانی بکوژم؟

– ئاخر، ئیتر؛ ئەمە جەنگە کوڕی خۆم.

– جەنگی نێوان دوو حکوومەتی عێراق و ئێرانە؛ جەنگی من نییە. من جەنگم لەگەڵ کەسدا نییە.

– ناشبیتە پێشمەرگە؟

– حەزناکەم ژیانم سەرتاپای لەناو ئەشکەوتان و لە ناو تەڕاشان بەهەدەر بڕوا.

– ناشبیت بە جاش..

– نەخێر؛ نامەوێ سومعە و کەرامەتم بشکێت و تا هەتایە هەر ڕووزەردی میللەتەکەم بم.

باوکم، لێم توورە بوو:

– ئێ، دە، کوڕم؛ ئەمڕۆ هەموو خەڵک یان جاشن، یان عەسکەرن، یان پێشمەرگە...

باوکم ڕاستی دەکرد: جەنگی عیراق و ئێران خەڵکی بە بێلایەن نەهێشتبۆوە. لە ڕووی باوکم ڕاوەستام:

– وایە، بەڵام من نامە هیچیان.

باوکم توورەتر، هاواری کرد:

– ئێ، دە هەر ڕۆژێکە ئیستیخبارات و پۆلیس لێمان وەژوور دەکەون و قۆڵبەندت دەکەن، بەبەر چاوی هەموو خەڵکەوە گوللەبارانت دەکەن! ئەو وەختەش دایکت لە حەژمەتان شێت دەبێت و منیش دەبێ لە داخی هەمووتان خۆم بکوژم!

گوڵنۆش نەیهێشت نائارامی لەوە زیاتر ڕۆحم بکرۆژێ: پێنج صەد دۆلارەکەی لەناو دەستم دەرهێنا و پەستایە گیرفانمەوە:

– هەڵیگرە!

من تەماشای ئەوم دەکرد.

گوتی: دڵ لە دڵ مەدە. بڕۆ!

گوڵنۆش ئەمەی گوت و تەماشای دایکمی دەکرد «کە لەسەر پێپیلکەیەکی شکاوی حەوشەکەمان بەتەنیا دانیشتبوو، دەگریا». پاشان گوڵنۆش بە دەنگێکی گریاناوی و لە هەمان کاتدا بە ئازایەتییەوە وتی:

– لە دوورە وڵاتیدا تۆ ئەگەر بشمریت، بە مردنی خۆت دەمریت؛ نەوەک لەم جەنگە نەفرەتبار و بێ مانایەدا بکوژرێیت.

من چاوەکانم لەوکاتەدا پڕ ببوون لە فرمێسک، وتم:

– دەترسم.

– لە چی!

وتم: لەوەی کە جارێکی دیکە نەتانبینمەوە.

ئەمەم وت و ئیتر لە پڕمەی گریانم دا.

– مسیوو!

دەنگی بارمانەکە ڕایچڵەکاندم.

«توولْووز!». سەرم بەرز کردەوە و سەیری بارمانەکەم کرد، زەرخەنەیەکی بۆکردم. وتم:

«نیو مریشکی سوورەکراو، تکایە»، «لەگەلْ فریت و شەربەتێکی پرتەقالْ».

## 2

ستاند و بۆرد و جانتاکەمم خستە سەر شانمەوە، جانتایەکی دیکەش بە دەستەی چەپمەوە، بەرەو ناو بازاڕ بەڕێ کەوتم.

هیلاکیی نەخەوتن، ماندوویی هەشت سەعاتی ناو شەمەندەفەر کەمێک لە گیانم تەریبوونەوە. باش بوو، بەدەم نانخواردنەوە ئیسراحەتێکی باشم کرد. بیرم لەوە دەکردەوە کە دەبووایە بچم لەناو بازاڕ ئوتێلێک بدۆزمەوە بۆئەوەی کەلوپەلەکانمی تێ بهاوێم.

ئەمە یەکەم جارم بوو لە پاریسەوە بێم بۆ توولْووز. ناو شارەکە شارەزا نەبووم. وەک هەر گەڕیدەیەکی نامۆ کە تازە دەگاتە ناو شارێک، غەریبانە دەڕۆیشتم و چاوم بە دەوروبەری خۆمدا دەگێڕا.

دوو شەقامی درێژی پان و پۆڕ لە بەردەمما درێژ ببوونەوە. جۆبارێکی ئارام لە ناوەڕاستدا لە یەکتری جودا کردبوونەوە. هەر دوو کەناری جۆبارەکە، وێڕای هەر دوو شۆستەکان، بە دارکاژ و دارچناری بلْند و سەرکەش چنرا بوون. چڵەپۆپ و لقەکانیان، زۆر بەرزتر لە لوتکەی ئاپارتمان و بینایە و دوکانەکان (کە زۆربەیان بە کەرپووچی سوور بینا کرابوون) بە کزەبایەکی فێنک هێورهێور دەلەنجانەوە. نەشئە و ئارامییەکی خۆشیان پێ دەبەخشیم.

توولْووز!

شاری (توولْووز لۆتریک )، ئەو هونەرمەندە گەورەیەی کە لە تیاترۆخانەی (ئاشی سوور) لە پاریس سەری نایەوە و ڕەنگی سوور کوشتی! سەیرە، ئەو هونەرمەندە بۆچی ئەم شارە ئارام و خۆشەی خۆی جێ هێشت و هاتە پاریس؟ بۆچی هاتە ناو ئەو ئاشە سوورە ڕۆحڕەتێنە؟

دوێنێ شەو، پێش ئەوەی سواری شەمەندەفەر بم و پاریس بەجێ بهێڵم، لەگەلْ





نەریمان، خەلیل، بێجان، شازاد، سیامەند.. هەر بەبۆنەی ئەم سەفەرە لە ناکاوی منەوە، لە قاوەخانەکەی (مۆنماخت) دانیشتبووین باسی «ڕەنگی سوور» و فیگەرە ڕووتەکانی ئەو هونەرمەندەمان دەکرد.

نەریمان دەیزانی کە من لەم سەفەرەمدا نیازم وایە چەند ڕۆژێکیش لە توولْووز بمێنمەوە، وتی:

– کەواتە دارا، تۆ کاتێ دەچیتە توولْووز، سەرێکیش لە مۆزەخانەکەی توولْووز لۆتریک دەدەی!

– باوەڕناکەم.

– بۆ؟

– چونکە مۆزەخانەکەی توولْووز لۆتریک لە شارۆچکەیەکی دیکەیە بە ناوی ئەلبی، نزیکەی سەعات و نیوێک لە سەنتەری شارەکەوە دوورە.

نەریمان دیسانەوە کونجکۆڵانە دەیویست قسەم لێ دەربێنێ:

– ئەدی دوای توولْووز؟

– ئێ؟

–یەکڕاست بەرەو بەرشەلۆنە دەڕۆی؟

دەمویست وەڵامی بدەمەوە بلْێم «جارێ نازانم»، سیامەند وتی:

– بەخوا تۆش سەیری، دارا.

وتم: بۆ؟

وتی: ئەدی بەم هاوینە خۆشە کەس پاریسی بەجێ هێشتووە بۆ بەرشەلۆنە؟

– باشە، تۆ دەچیتە توولْووز یان دەچیتە بەرشەلۆنە؟

شازاد لەجیاتی من وەڵامی دایەوە:

– دەچێتە توولْووز، لەوێشەوە دەچێتە بەرشەلۆنە.

بێجان کەبابی دەجوو، وتی:

– پیاو بەم گەرمایە تا لە پاریسەوە دەگاتە بەرشەلۆنە، لەناو گەرمای شەمەندەفەر، ئێسقانی دەڕزێ.

خەلیل لە شوێنی خۆیەوە، بە دەنگی بەرزی سوعبەتاویی خۆیەوە تێی هەلْکرد:

– ئەو لە بەرشەلۆنەش خوارتر دەڕوا.

– بەرەو کوێ؟

– بەرەو کەنارەکانی زەریای ئەتلْەنتیک..

–کەس نازانێ بەرەو چ گوندێک!

– مەگەر تەنیا خوا بزانێ دارا بەرەو کوێ سەرهەڵدەگرێ.

– سەفەری عومرە..

– دەچێتە «جەزیرەی واق واق»!

بەم قسەیەی خەلیل، ئیتر هەموویان دایانە قاقای پێکەنین. منیش، بێدەنگ، شەرابە هەنارییەکە نەشئەیەکی خۆشی پێ بەخشیبووم، زەردەخەنەیەکم کرد و بە خۆشەویستییەوە تەماشای خەلیلم دەکرد. هەمیشە دڵم بە لەهجە خۆش و قسە خۆشەکانی خەلیل دەکرایەوە.

ئاگام لێ بوو، ئەو شەوە، لەبەر ئەم سەفەرە لەناکاوەی من، هاوڕێکانم گاڵتەکردن و ڕابواردنیان بە «دختۆر نووری» بەتەواوەتی لەبیر چووبۆوە. شەوانی جاران کە دادەنیشتین، هەر کاتێ بیانویستایە بکەنە گۆڵمەزێک و بیانویستایە شەوبێرییەک بە سوعبەت و پێکەنین و قسەی خۆش بەسەر ببەن، «دختۆر نووری» و دوکانەکەیان دەکردە بنێشتە خۆشەی سەر زارییان. هەموو جارێک تەنیا ئەوەندە بەس بوو کە یەکێکیان لە ئەوی دیکەی بپرسیایە:

– ئەرێ دختۆر نووری خەبەری چییە؟

ئیتر دەستیان پێ دەکرد.

نووریی بەستەزمان! خەڵکی قامیشلی، سێزدە ساڵە ئاوارەی ئەم ئەورووپایە بووە و ئێستا لە پاریس گیرساوەتەوە. لە بەرامبەر باغی لووگزەمبوورگ بۆ خۆی کووشکێکی بچکۆلانەی کردۆتەوە و ڕۆژنامە و گۆڤاران دەفرۆشێ. بە قسەی خەلیل، گوایە جارێکیان نووری گێڕاویەتیەوە کە ئەوکاتەی هێشتا لە قامیشلی بووە، پێش ئەوەی سەری خۆی هەڵبگرێ و ئاوارەی ئەورووپا ببێت، لە ڕۆژی ماڵئاواییدا بە دایکی خۆی گوتووە:

– دایە، دەچم لە زانکۆیەکی پاریس لە پزیشکی دەخوێنم، دەبمە دختۆر.

ئیتر لەو ڕۆژەوە کە ئەم قسەیەی، لەو چێشتخانەیەی مۆنماخت، بۆ خەلیل و هاوڕێکانی گێڕاوەتەوە؛ بۆتە پێکەنین و هەرا. هەر لەو ڕۆژەوەش ناویان لێ ناوە «دختۆر نووری»: چونکە لە جیاتی ئەوەی لە پاریس ببێتە دختۆر، هاتووە دوکانێکی لە بەردەم باغی لووکزەمبۆرگ کردۆتەوە و ڕۆژنامە دەفرۆشێ!

ئەوەیە ئیتر، ژیانی منیش لە پاریس وەک ئەم نوکتە سارد و غەمگینە ساڵانێکی زۆر بوو ببووە شتێکی ڕۆتین و سواو. تا لە پاریس مابایەمەوە، دەبوایە هەموو ڕۆژ، هەموو ڕۆژ بە هەمان شێوە، هەر هەمان شت ببیستمەوە: هیچ شتێکی تازە لە ژیانم ڕووینەدا.

من ئەوا حەوت ساڵی ڕەبەقە لە پاریس دەژیم. ئەگەر حەوت ساڵی دیکەشی تیا





بمێنمەوە، ژیانم – دڵنیام – هەر ئەوە دەبێ کە بوو: بەیانیان، کاتژمێر حەوت و نیوی بەیانی ڕەپێ بەوە، میترۆ بگرە «نیو سەعت لەناو میترۆ» بچۆ سەر کار، پاش نیوەڕۆ بگەڕێوە ژوورە بچکۆڵەکەت، بەپەلە نانێک بخۆ، دووشێک بگرە، دیسان ڕاکەوە بەرەو مۆنماخت؛ ستادەکەت هەڵدە و چاوەڕێ بە تا کەسێک دێ و دادەنیشێ، ئۆتۆماتیکیانە وێنەیەکی بەپەلەی بازرگانیایانەی بۆ بکێشە، پاشان کەسێکی تر، تابلۆیەکی تر، دووی تر، سێیی تر؛ ئینجا کە ئێوارەش دادێ، دیسانەوە ستاد و بۆرد و کەلوپەلەکانت بپێچەوە، هەڵتەک هەڵتەک، بەرەو چێشتخانەکەی مۆنماخت تا نیوەشەوان بەدەم خواردن و خواردنەوەوە گوێ لە سوعبەت و پێکەنین و هەرای هاوڕێکانت بگرە کە چۆن بە دختۆر نووری یا بەیەکتری ڕادەبوێرن و پاشملە باسی یەکتر دەکەن؛ ئینجا نیوە شەوانیش کە تەواو سەرخۆش دەبیت و هەستی بێکەسی و غەریبایەتی و فیگارییەکی بێ سەر و شوێن بە تەواوەتی گیانت داگیر دەکا، بە داهێزراوی و ڕەتاوییەوە دوایین میترۆی نیوەشەو بگرە، بچۆرەوە ژوورە سارد و تاریکەکەی خۆت: دانیشە، بەدیار قاوەیەکی ساردەوە، هۆن هۆن بەسەر وێنە فۆتۆگرافییەکانی سێزدە ساڵ پێش ئێستەتەوە بگری! حەیف! خۆشیی هەموو ژیانت، لەوانەیە تەنیا ئەو شەوانەی پشووی شەممە و یەکشەمموان بێت، کە جار جار لەگەڵ (ڕووزین)، یان لەگەڵ هەر ئافرەتێکی دیکە، کە ئەو شەوە پێی خۆش بووە لەگەڵت بێتە ماڵەوە و شەوێکی جیاوازت لەگەڵ بەسەر ببات! ئەدی چی؟ چی لەناو ئەو حەوت ساڵەی ڕابردووی ژیانت لە پاریس بەدی دەکەیت کە ئەمڕۆ دڵت خۆش بکا و داهاتووت – هیچ نەبێ بۆ ماوەیەکی کەم – مسۆگەر بکا!؟ هاوڕێکانت ئارەزووی خۆیانە، لەوانەیە ئەوان چێژێکی تایبەت لەم ڕۆتین و لەم شێوە ژیانەی خۆیان ببینن.

سەیرە! بەدرێژایی ئەو سێ شەوەی دوایی، لەوەتەی لە شازادیان بیستبۆوە کە من نیازی سەفەرێکم هەیە، هاوڕێکانم، یەک یەک، هەر لە خەلیلەوە تا دەگاتە بێجان و بەهجەت وەلی و کامەران، هەموو ئێوارەیەک، هەر کە دەگەیشتنە چێشتخانەکە و دادەنیشتن، یەکەم پرسیاریان لەبارەی سەفەرەکەی منەوە بوو! هەستیان دەکرد کە ئەم سەفەرە لەناکاوەی من سەفەرێکی ئاسایی نییە، تووشی نامۆیی و سەرسوڕمان هاتبوون.

– کۆنە یارێکی لە شاری ئەلبی هەیە. تا ئەلبی دەچێت و دەگەڕێتەوە.

– نەخێر، بەیەکجاری پاریس بەجێ دەهێڵێت و ناگەڕێتەوە.

– حەتمەن ژنێکی کەترەی دەوڵەمەندی باشووری دۆزیوەتەوە و «شووی پێ دەکا».

– باشە لێرە، لە پاریس، لە چیی کەمە؟ ئەم کوڕە زۆر شێتە!

– ئەگەر مەسەلەکە ژن و ژنخوازی بێت، خۆ ئێرە بۆ ئەو مەسڵەحەتترە.

– وەڵا ڕاست دەکا: پاریس پڕە لە ژنە جوولەکەی پورتوگالیی کەترەی جوان..

سیامەند ئەم قسەیەی خستە سەر قسەکەی پێشووی بێجان:

– خواخواشیانە مێرد بە پیرەکورێکی ڕۆژهەڵاتیی وەک ئەو بکەن.

– دارا زۆر موعجیبی ئەندرێ بڕۆتۆنە، دەچێ بۆئەوەی لە ئاسەوارەکانی باشوور ورد بێتەوە!

نەریمان، بێ ئەوەی ئاگاداری هۆ و ئامانجی سەفەرەکەشم بێ، ئەو وەڵامەی دانەوە.

– ئنجا برۆتۆن چووە ئەفریقا.

– جا کێ ناڵێ ئەویش لەوێوە ناچێتە ئەفریقا؟

هاوڕێکانم، هەموویان، کونجکۆڵانە حەزیان دەکرد بزانن لەم سەفەرەدا بەرەو کوێ دەچم؟ دەچمە کام وڵات، کام شار؟ بۆچی دەچم؟ بەرەو لای کێ؟ تاکەی هەر لەوێ دەمێنمەوە! منیش ئیتر لە شەوی یەکەم و تەنانەت لە شەوی دووەمیشدا، وەڵامی هیچ یەکێکیانم نەدەدایەوە، هەمیشە دەمگوت: «جارێ نازانم».

خەلیل وازی لێ نەدەهێنام، دەیگوت:

– چ نازانی؟

– نازانم دەچم یان نا.

دوێنێ شەو، پێش ئەوەی چێشتخانەکە بەجێ بهێڵم و بەرەو وێستگەی شەمەندەفەری ئۆستەرلیچ بەڕێ بکەوم، ستاد و بۆرد و جانتا و کەلوپەلەکانی خۆمم ئامادە کردبوون و لە تەنیشت مێزەکەم، لە پاڵ خۆمم دانا بوون؛ کاتێ سیامەند هاتە ناو چێشتخانەکە، جانتا و کەل و پەلە پێچراوەکانی منی بینی، یەکسەر، پێش ئەوەی بچێ لەسەر کورسییەک، لە دەوری مێزە درێژەکەمان دابنیشێت، تەماشایەکی جانتا و کەلوپەلەکانی تەنیشت مێزەکەی منی کرد و وەرسووڕایەوە لای کورسییە چۆڵەکەی ئەودیو:

– ئەوە بەڕاستیتە، دارا؟

– چی؟

– سەفەر دەکەی!

تەماشای نەریمانم دەکرد، کە دوای ئەو هاتە ژوورەوە؛ گوتم:

– بەڵێ.

سیامەند دیار بوو پێی ناخۆش بوو:

– بەڕاستی دارا، ئەم سەفەرە لەناکاوەی تۆ، لە جۆرە سەرهەڵگرتنێک دەچێ.

نەریمان وتی:

– تۆ بڵێ تەنانەت لە جۆرە شێتییەکیش!





ئینجا بێجان، زۆر بە سۆزەوە، نەوازشکارانە ڕووی تێم کرد:

– دارا گیان، ئێمە هەموومان هەر یەکە و حەوت هەشت ساڵە لە پاریس دوورە وڵاتین، زەلامی وا هەیە هەژدە ساڵە ئاوارەیە و وڵاتی خۆی نەدیوە. ئێمە تازە تەواو بووین؛ بۆ هەر کوێیەک بچین، هەر ئاوارەین..

– بۆ هەر وڵاتێک بچین هەر بێ وڵاتین.

– دانیشە، لەناومان بمێنەوە!

سیامەند ڕووی کردە بێجان:

– ستاد و جانتا و کەلوپەلەکانی نابینن!

بێجان، وتی:

– ئێ باشە باش.. ئێمە هەر هیچ نەبێ لەبەرئەوەی هەموومان کوردین؛ با پێمان بڵێت بۆ کوێ دەچێ، بۆ کام شار؟ ئەگەر خوا نەکا شتێکی بەسەرهات!

لەوەدەمەدا لەگەڵ شازاد تەماشای یەکترمان دەکرد. سیامەند وتی:

– ڕاست دەکا، دارا! بۆکام شار دەچی، بۆلای کێ؟ با بزانین! بەڕاستی.

منیش ئیتر گەیشتە تینم، وتم:

– دەچمە سانتیاگۆ.

نەریمان، سەرسوڕماو، یەکسەر گوتی:

– سانتیاگۆ لەکوێیە؟

– کام سانتیاگۆ؟

شازاد لەسەرەخۆ بۆی ڕوون کردنەوە:

– شارۆچکەیەکی بچکۆڵەیە لە باکووری ئیسپانیا..

بێجان گوتی:

– من باوەڕناکەم ئەم شارە لەسەر نەخشەی جوگرافیای دنیادا بوونی هەبێت.

– لەسەر سنووری زەریای ئەتڵەنتیکە.

خەلیل دەنگی بەرزکردەوە:

– ناڵێم! دەچێتە جەزیرەی واق واق.

– سانتیاگۆ دی کۆمپۆستێللا.

سیامەند ڕووی لە من کرد:

– بۆ دەچیتە ئەو شوێنە لاتەریک و دوورە، دارا؟

خەلیل گوتی:

– باپیرەگەورەی لەوێ نێژراوە؛ دەچێتە سەر مەزاری.

نەریمان و بێجان بە قسەکەی خەلیل دایانە قاقای پێکەنین.

– کەس لەوێ دەناسی؟

وتم: «بەڵێ».

شازاد زەردەخەنەیەکی کەیفخۆشانە ڕوخساری گەشاندەوە، وەک ئەوەی ئیتر نهێنییەک بدرکێنێ، لەسەر ئاوازی خوێندنەوەی شیعرە خۆشە پڕ لە هەستی غەریبییەکانی، ڕووی کردە من:

– لەوێ، گوڵ و دەزگیران و ئاسمان و ماڵ و وڵات و.. هەموو شتێکی دیکەی لێیە!

خەلیل هەر دوو دەستی بەرز کردەوە، وەک ئەوەی ئیتر دڵی بە تەواوەتی ئاوی خواردبێتەوە، بەدەم پێکەنینەوە وتی:

– ئەوێ، گوڵ و دەزگیران و ئاسمان و ماڵ و وڵات و.. هەموو شتێک، هەموو شتێکی دیکەی لێیە! ئەڵڵاه.. شیعرە! کوڕینە، سا حەقی وایە ئێمەش هەموومان بەگەڵی بکەوین!

شازاد گوتی:

– ئنجا بە ڕاستی ئەوێ شوێنی ڕەسم کردنە!

خەلیل گوتی:

– گوند و سروشت و ئەم جۆرە شوێنانە بۆ ئێمە دەری ناهێنێ، کاکە!

– ئێمە تازە لە پاریس ڕاهاتووین؛ کیلۆمەترێک لە پاریس دووربکەوینەوە دەمرین..

– لە برسان..

– لە بێ ماڵییان..

– لە بێ پارەییان...

شازاد گوتی:

– دارا بەدووای پارەدا ناگەڕێ.

خەلیل گوتی:

– بەڵێ، دارا بەدوای باپیرەگەورەی خۆیدا دەگەڕێ: لە سانتیاگۆ نێژراوە.

شازاد گوتی:

– خەلیل، بەس هێندە ئیهانەی ئەو برادەرە ئازیزەی خۆت بکە!

– ئیهانەی چیم کردووە؟ دەڵێم لەوانەیە بەدووای گۆڕی باپیرەگەورەی خۆیدا بگەڕێ.

– نەخێر، بەدووای هونەردا دەگەڕێ.





–ئەوە بۆیە ستاد و بۆردەکەشی لەگەڵ خۆی دەبا!

هەژار هەڵی دایە:

– کاکە، بەسە! وازی لێ بێنن با بڕوا! بوو بە چی؟

خەلیل بە خۆتێ هەڵقورتاندنی شازاد کەمێک سەغڵەت ببوو، ڕووی لە بێجان کرد:

– بەدووای هونەردا دەگەڕێ، قەیناکە؛ بەڵام با کاک شازاد مزایەداتمان لەسەر نەکا!

– مزایەداتی چیم کردووە؟

– تۆ چونکە خۆت شاعیریت و نازانی ڕەسم بکەیت، واتێ دەگەی ئێمەی هونەرمەند هەموومان «لە مۆنمارت کەوتووین و» بازرگانی بە ڕەسمەوە دەکەین؛ تەنیا دارا هونەرمەندی ڕاستەقینەیە.

– نەخێر..

– با، لە شوێنی تریش ئەم قسەیەت کردووە.

من لێرەدا دەبوایە قسەیەک بکەم، گوتم:

– ئێ بۆچی؛ چما من بۆ خۆشم پۆرترێت ناکەم؟

خەلیل ڕووی لە نەریمان بوو کە هەر پێی دەگوت «بیبڕەوە». لەناکاو گوتی:

– ئێ، من چیم گوتووە؟ دەڵێم: گوند و سروشت و ئەم جۆرە شوێنانە بۆ ئێمە دەری ناهێنێ. تەنانەت ئێستا کوردستانیش، بە نیسبەت ئێمەوە، وەک گوندێک وایە، گوندێکی پیسی سەدەکانی ناوەڕاست؛ چیتر ناتوانین تێیدا بژین..

شازاد بەسەر خەلیلدا گرژ بۆوە:

– کە خەڵکی وەک تۆ چیتر ناتوانن بگەڕێنەوە لە کوردستان بژین، ئەمە لەبەر ئەوە نیە کە کوردستان گوندێکی پیسی سەدەکانی ناوەڕاستە.

– ئەدی لەبەر چییە؟

– لەبەرئەوەی ئەمڕۆ، ئەگەر خەڵکی وەک تۆ بگەڕێتەوە کوردستان، نە شەهادەیەکت هەیە پێی تەعین ببیت، نە کاسبییەک لێرە فێر بوویتە.. دەست و پێ سپی، لەوێ چی بکەیت! بەڕاستی، تۆ بە کەڵکی چیی کوردستان دێیت، بۆچی بگەڕێیتەوە؟

– بۆ خۆمان لێرە، هەتا هەتایە بازرگانی بە ڕەسم و هونەرەکەمانەوە دەکەین و بۆ خۆمان هەر پارە کۆدەکەینەوە.. وا نییە؟

– ئەمە تۆ خۆت دانی پێدا دەنێی.

– تۆش بۆ خۆت تا هەتایە بێ ئیش و بێ پارە و بێ ماڵ و حاڵ هەر خۆت بە شیعرەکانت و بە شەهادەی دکتۆراکەتەوە هەڵبکێشە.

– هەلّبەتا؛ چونکە ئەو پۆرترێتە بازرگانییەی کە تۆ بۆ تووریستەکانی مۆنماختی دەکەیت، لە کوردستان بە دوو دیناریش کەس لێت ناکڕێ!

– ئەدی بۆچی کە دەلّێم کوردستان گوندێکی سەدەکانی ناوەڕاستە؛ لێم تووڕە دەبی؟ لە ولاّتێکدا هونەر نرخی نەبێت و جوانی قەدری نەگیرێت.. گوو بەو ولاّتە! تۆش لەم پاریسە هەر لە برسان بکڕووزێرەوە و با هەر بەلەدیە بەخێوت بکا.. هەی شاعیری نەگبەت!

شازاد گوتی:

– تۆ خۆشت بەلەدیە کەم بەخێوی نەکردووی، خەلیل. باش نییە من بیر لە چارەسەرێک بۆ خۆم دەکەمەوە.

– چارەسەرەکەت ئەوەیە کە چاوەڕێ بکەیت حزبە کوردستانییەکان مفاوەزاتێک لەگەلّ ڕژێم بکەن بۆئەوەی تۆش بتوانیت بەیەکجاری بگەڕێیتەوە سلێمانی. هەر بۆیەش ئەم قسانە دەکەیت و ئێمەت لەلا بۆتە بازرگان و «هونەرمەندی ساختە»!

نەریمان گوتی:

– بەسیەتی، خەلیل!

خەلیل هێور نەدەبۆوە:

– ئاخر، پێم دەلّێ کە هونەرەکەی من لە کوردستان بە دوو دیناریش کەس نایکڕێ! ئەو بۆ خۆیشی، ئەو شەهادەی دکتۆرایەی وەری گرتووە، خەلّکی ئێرە بە دوو فرەنکی سووتاو لێی ناکڕن.

شازاد یەک قسەی دیکەی کرد و ئیتر بێدەنگ بوو:

– خەلّکی وەک ئێوە، تازە لە پاریس ڕاهاتوون؛ کیلۆمەترێک لە پاریس دووربکەونەوە، دەمرن.

بێدەنگیەکیی لەناکاو بالّی بەسەر مێزەکەدا کێشا. پاشان، بێجان لە سەرەخۆ بێدەنگییەکەی شکاند؛ ڕووی لە من کرد و بەهێمنییەوە وتی:

–کەی دەگەڕێیتەوە، دارا؟

وتم: «ناگەڕێمەوە».

نەریمان بە حەپەساویەوە، بەلاّم بەهێمنی، یەکسەر سەری بەرزکردەوە:

– هەر بەیەکجاری؟

– بەیەکجاری.

– ئێ بۆ؟

– دەچم لەوێ دەژیم.





– بەڕاست؟

– بەڕاست.

بێجان بە غەمگینییەوە گوتی:

– شازاد بگەڕێتەوە کوردستان و.. دارا سەری خۆی بەرەو سانتیاگۆ هەلّبگرێ.. ئیتر پاریسمان لێ چۆلّ دەمێنێتەوە.

نەریمان ڕووی کردەوە دارا:

– هەر بەیەکجاری لەوێ دەژیت؟

– هەر بەیەکجاری لەوێ دەژیم.

– کەواتە ئیدی چیتر نایەیتەوە پاریس.

– لەوانەیە.

– چۆن؟

– جارجار، بە سەفەر.

لەوکاتەدا، دیسان بێدەنگییەکی سەرسوڕمێن بالّی بەسەر دانیشتنی سەر مێزەکەماندا کێشا. تەماشەیەکی شازادم کرد، پاشان تەماشایەکی کاتژمێری قەد دیواری چێشتخانەکەم کرد و هەلّسامەوە گوتم:

– درەنگە.

شەمەندەفەرەکەم سەعاتێکی تر بەڕێ دەکەوت.

## 3

کاتێ خەریک بووم چێشتخانەکەی مۆنماخت بەجێ بهێلّم و بچمە وێستگەی شەمەندەفەر، نەریمان و بێجان و شازاد لەگەلّم هەلّسانەوە، بێجان وتی:

– تا وێستگەی شەمەندەفەر لەگەلّت دێین.

سیامەند و خەلیل لەسەر مێزەکە، لە شوێنی خۆیان نەبزووتن، سیامەند دەستی تەوقەی بۆ درێژکردم، وتی:

– دەی، دارا سەفەرێکی خۆش.

ئینجا خەلیل لەناکاو هەلّسایەوە، پێکەنی و باوەشی بۆ کردمەوە:

– دارا گیان، ببوورە، من ناتوانم بێم بەرێت بکەم، چاوەڕێی (کریستین ) دەکەم.

پێش ئەوەی بگەینە ئێسگەی شەمەندەفەر، لە ڕێگادا بێجان بە ئاوازێکی غەمگینەوە دەیگوت:

– دارا، کە دەڕۆی، بەڕاستی شوێنت لەناومان دیار دەبێ. نامەمان لێ مەبڕە!

– هەرکە گەیشتیتە ئەوێ و لە شوێنێک گیرسایتەوە، ئادرەسی خۆتمان بۆ بنێرە!

شازادیش دەیگوت:

– ئەوەیە ئیتر، ئێمەش لێرە، وەک جاران درێژە بە ژیانە ڕۆتینە ئاوارەییەکەی خۆمان دەدەین.

– بە ڕۆژ کارکردن و بە شەو ئێرە.

– سیامەند هەر کرێکارییەکەی خۆی و کارگە پڕ مەکینە و دووکەڵ و ئاسن و وایەرەکانی. بێجان هەر تەرجەمە کردنی فارسی – فەڕەنسی و دایەرە چکۆلانەکەی لە پلاس دیتالی. بەهجەت وەلی خۆی و بێچوە پشیلەکەی لە کوختەکەی خۆیدا لە قاتی حەوتەمی ئاپارتمانەکەی لە ژاڤێل. کامەران و مامەند و نەریمان و خەلیلیش هەر نیگار کێشان و مۆنماختەکەیان..

شازاد هێشتا قسەکەی خۆی تەواو نەکردبوو، نەریمان بە زەردەخەنەیەکی غەمگینەوە پێ کەنی:

– شازادیش، هەر حەڕاسەتی شەوانی ئوتێلەکەی و شیعرەکانی...

شازاد ڕووی کردە من:

– ئەوەیە ئیتر، باش دەکەی دەڕۆی، دارا گیان!

هەموومان، بێدەنگ، لەژێر دارعەلەتریکە درێژەکانی سەرشۆستەکەدا دەڕۆشتین و هیچ قسەمان نەدەکرد. لەوکاتەدا هەستم بە سوگواری و غەمگینیەک دەکرد کە من دروستم کردبوو. سەبارەت بەمە، زۆر دڵم تەنگ بوو. هەستم بە بێزەوەنیی خۆم دەکرد. من مادام بڕیارم دابوو بڕۆم و بەیەکجاری پاریس جێ بێڵم، نەدەبوایە بە کەس بڵێم کە دەڕۆم. لەو کاتەدا، ئەو ڕۆژەم بیر هاتەوە، کە چەند ساڵێک لەمەوبەر ماڵ و برادەرەکانی خۆم لە هەڵەبجە بەجێ هێشت؛ خەریک بووم بەیەکجاری ماڵ و حاڵ و وڵاتەکەمم بەجێ دەهێشت و بەرەو غەریبی بەڕێ دەکەوتم: لە دۆڵی گوڵان، لەودیو هەڵەبجە، حەکیم و حیکمەت و کەریم و سەردار، جانتا و کەلوپەلەکانیان بۆ هەڵگرتبووم و دەیانویست تا ئەو کاتەی لە گۆڕستانەکەی گوڵان دەپەڕمەوە و لە سنوور ئاوادەبم، بەڕێم بکەن. حیکمەت دەگریا، دەیگوت:

– دارا گیان، وا دەڕۆی. بەم نزیکانە ئێمەش هەر وەک تۆ هەڵەبجە بەجێ دێڵین و دەکەوینە دوورەوڵاتی.

لەسەر شۆستەکە، بەدەم بیر هاتنەوەی یادگارییەکانی ئەو ڕۆژگارە دوورە دەست و شیرینە، هێور هێور هەنگاوم دەنا و لە دڵی خۆمدا دەمگوت: «ئەوەتا، وا دیسانەوە لە کۆمەڵێک برادەر و خۆشەویستی دیکەم دادەبڕێم»، «پاریس بەجێ دەهێڵم و بەرەو گوندێکی نەدیتی و نەناسراو سەری خۆم هەڵدەگرم»، «ئەوەتا.. وا دیسانەوە وڵاتێک





بەجێ دەهێڵم و بەرەو وڵاتێکی دیکە دەچم.. ئەمەیە ژیانی من».

ڕووم لە شازاد کرد:

– شازاد، جاربەجار شیعرە تازەکانتم بۆ بنێرە!

شازاد وتی: «باش». پاشان گوتی:

– بەڵام خۆ شیعریش هەر هەمان ئەو جیهانەیە کە تازە چیتر نایبینینەوە!

کە گەیشتینە ناو وێستگای شەمەندەفەرەکە، نەریمان ناونیشانی یەک دوو برادەری نیگارکێشی ئیسپانیی خۆی دامێ، وتی گوایە کە وەختی خۆی لە ڤیەننا پیشانگایەکی هاوبەشی لەگەڵیان کردۆتەوە و باش دەیانناسێ، هەروەها پێشنیهادی ئەوەی لێ کردم کە لەسەر ڕێگەمدا لە (بەرشەلۆنە ) دەتوانم چەند شەوێک لەلای ئەو برادەرانەی بمێنمەوە، بەم بۆنەیەوە بەرشەلۆنەش ببینم.

کامەران دەفتەرێکی بچکۆلانەی لە باخەڵی دەرهێنا:

– قەرەنی جەمیلیش لەوێ دەژی.

نەریمان، کە زووزووە نامەی ئەو هاوڕێ نیگارکێشەمانی بەدەست دەگەیشت، وتی:
– نا، لەوێ نەماوە. ئێستا چۆتە «مۆسکۆ».

بێجان لاپەڕەکانی دەفتەرەکەی دەپشکنی:

– ئادرێسەکەی جەعفەریشم لایە.

– جەعفەر کاکەیی؟

من وتم: «نا، باوەڕناکەم».

– چی؟

– باوەڕناکەم لە بەرشەلۆنە بمێنمەوە.

– بۆچی؟

وتم: تەنیا چەند ڕۆژێک لە تووڵووز دەمێنمەوە، بۆ ئەوەی هەندێ پارەی دیکەم دەست بکەوێت.. ئیتر لەوێوە یەکسەر بەڕێ دەکەوم، دەڕۆم.

– یەکسەر بەرەو سانتیاگۆ؟

وتم: بەڵێ.

لە لێواری هێڵی شەمەندەفەرەکان ڕاوەستابووین. بێجان ڕووی لێ کردم:

–سانتیاگۆ لە بەرشەلۆنەوە چەند دوورە، دارا؟

شازاد پێش من، بەزەردەخەنەیەکی پڕ نەشئەوە، وەڵامی دایەوە:

– بیست و حەوت سەعاتی ناو شەمەندەفەر.

بێجان بەسەرسوڕمانەوە، فیتەیەکی درێژی لێ دا.

نەریمان رووی لە شەمەندەفەرەکان بوو، تەماشای دووری دەکرد، وتی:

– دارا گیان، وابزانم شەمەندەفەرەکەت هات.

– سەفەرێکی خۆش.

## 4

– بەخوا من دەزانم: لەدەست مشکەکانی ناو ماڵەکەت ئەم پاریسە خۆشە بەجێ دێڵی!

لە توولوز، لەناو حەمامی هۆتێلەکە، لەژێر دووش، بەدەم خۆشتنەوە بیرم لەم قسەیەی خەلیل دەکردەوە و لەبەر خۆمەوە پێ دەکەنیم.

– ئێ باشە بۆ کوێ دەچی؟

– پێم وتی، وتم: بۆ ئیسپانیا.

– بۆ کام شار؟

منیش وەک ئەوەی وەڵامی مەتەڵێکی لێ بشارمەوە، سەیرێکم کرد و وەڵامم نەدایەوە. وابزانم نەریمان بوو، وتی:

– ڕاست دەکا، دارا؛ پاریس، بە پێچەوانەوە، ئەم وەختانەی هاوینان خۆشە.

سیامەند سێوی دەخوارد، وتی:

– پیاو هاوینان دوو ڕۆژ مۆناخت بەجێ بهێڵێ، بەلای کەمەوە دوو هەزار فرەنکی لە قیس دەچێ.

«دختۆر نووری» دەستی بۆ پەرداخی شەرابەکەی درێژکرد، وتی:

– بێزارییە، جانم!

ئینجا شازاد، کە نەشئەیەکی نەرم غەمگینیی چاوەکانی دەدرەوشاندەوە، رووی کردە نەریمان:

– ئێمە هەمیشە حەز دەکەین سەفەر بکەین، هەمیشە حەز دەکەین ئەو شوێنەی تێیداین بەجێی بهێڵین..

سیامەند بەتانووتەوە وتی:

– گەنجین...

شازاد بە هەمان نەشئەی مەستییەوە، وتی:

– نەخێر، چونکە وادەزانین ئەگەر ئەو شوێنە بەجێ بهێڵین، ئەوا ئیتر لە شوێنی





دووەم ئاسوودە دەبین و چیتر هەستی بێ وڵاتی و ئاوارەییمان نامێنێ.

شازاد ڕووی خستە سەر من. سەیری چاوەکانیم کرد، وتم:

– ڕاست دەکەی.

خەلیل هەڵیدایێ وتی:

– دە وەڵڵاهی، کوڕی کوڕیشمان چیتر وڵات نابینێتەوە. هەتا ماوین هەمیشە هەر لە دوورەوڵاتی و ئاوارەییدا ژیان بەسەر دەبەین.

دختۆر نووری وتی:

– کورد هەمیشە ئاوارەیە! هەمیشە ئاوارە بووە، هەر بە ئاوارەییش دەمێنێتەوە.

خەلیل گوتی:

– کوڕینە، بەخوا، نووری دختۆرە و دەیزانێ.. ڕاست دەکا!

بەهەجەت وەلی لە سوچی مێزەکەوە، دەنگی هەڵبڕی:

– ئێ باوکم ئاخر، ئیتر لە پاریسەوە بەرەو کوێ؟

بەم قسەیەی بەهجەت وەلی زۆر سەغڵەت بووم، چونکە یەکسەر ئەو قسەیەم بیر هاتەوە کە شازاد بۆی گێڕابوومەوە: بەهجەت وەلی چەند ڕۆژێک لەمەوبەر، هەر لەبارەی ئەو سەفەرەی منەوە، لەناو جەماعەتدا، گوتبووی:

– لێی گەڕێن جانم؛ منداڵە، تاکو ئێستاش هەر غەریبی دایکی دەکا.

هەروەها گوتبووی:

– ئەگەر ناوی خوشکێکی یان ناوی گەڕەکەکەی بێنن، سەعاتێک دەگریێ.

جەماعەتیش ئیتر دابوویانە قاقای پێکەنین.

بەهجەت وەلی وابزانم تەمەن سی و نۆ ساڵە. حەڤدە ساڵی ڕەبەقە لە پاریس دەژی، دکتۆرایەکی لە بارەی «ئایینی مەسیحیەت لە کوردستاندا» وەرگرتووە، جار جار دەهاتە ناومانەوە و خۆی هەڵدەکێشا، دەیگوت: «دووصەد لاپەڕەم بەس لەسەر مەسیحییەکانی کۆیە نووسیوە» بەڵام بە چی دەچێ؟ هەمیشە کە باس دێتە سەر باسی کوردستان، بە بێزێکەوە دەڵێ:

– من ناگەڕێمەوە، هەرگیز ناگەڕێمەوە.

شەوێکیان کە دیسان هەموومان پێکەوە لە دەوری مێزێک دانیشتبووین و چەند کەسێکی فەرەنسیمان لەگەڵدا بوو، لە گەرمەی دەمە قاڵی و گفتوگۆکردندا لەبارەی «دوواکەوتوویی خەڵکی خۆمان و پێشکەوتنی ژیانی ئەورووپییەکان» بەهجەت وەلی بە یەکێک لە میوانە فەرەنسییەکانی گوت:

– ئێمە پیترۆڵمان هەیە، ئێوەش عەقڵ، ئەمەیە جیاوازیمان.

ئینجا لە کۆتایی قسەکانیشی، ڕووی کردە من و بە قێزکردنەوەیەکەوە وتی:

– وڵات، وڵات! وڵات دۆزەخێکە، چڵپاوێکە؛ بەڕاستی: زەلکاوێکی گەورەیە بۆ خۆی! بۆ کوێ بگەڕێینەوە؟

من بەم قسەیەی بەهجەت زۆر جاڕس بووم، وتم:

– من تەنانەت غەریبیی زبڵخانەکانیشی دەکەم، غەریبی تەنانەت سەر گوفەک و چڵپاوەکانیش.

ئەمیش لە وەڵامدا گوتی:

– تۆ پیاوێکی خەیاڵیت. لەناو وەهمدا دەژیت.

وتم: بۆچی؟

وتی: «ئەمەی تۆ غەریبیی دەکەیت و بیری لێ دەکەیتەوە: کوردستان نییە».

– ئەدی چییە؟

– وەهمی کوردستانە، خەیاڵی کوردستانە!

منیش تووڕە بووم، گەیشتە تینم، پێم وت:

–ئەمەی تۆش بیری لێ دەکەیتەوە: ئەورووپا نییە..

– ئەدی چیە؟

– پیگال و پارتووس و ناولنگی ئافرەتە سۆزانییەکانتە.

ئیتر ئەوشەوە لەسەر ئەم قسەیە لەیەکتری زویر بووین، لەو شەوە بەولاوە هەرگیز یەکتر نادوێنین. ئەو شەوەش، کاتێ وتی «ئاخر باوکم، لە پاریس بەرەو کوێ؟»، دیسان وەڵامیم نەدایەوە، بەڵام لەناوخۆمدا هەستم دەکرد ڕقێکی تێکەڵ بە هەستی بێزکردنەوە لە ناخمدا دەیورووژاندم. نازانم بۆچی لەو دەمەدا، ژیانی ڕۆژانەی بەهجەتم هاتەوە بەرچاو، لە دڵی خۆمدا گوتم: (فەرموو، ئەم هەموو قسە گەورانە دەکا، کەچی ئەمەتا، لێرە – لە ئەورووپا – ئەمە ژیانیەتی: هەر ئێستا دوای نیو سەعات یا سەعاتێکی تر، پاش ئەوەی بوتڵی شەڕابە سوورەکەی بەردەم خۆی تەواو دەکا، قەرەوێتەکەی بە کەمێک ویقارەوە یەک دوو جاران دێنێ و دەبا و هەڵدەستێتەوە، جانتاکەی دەخاتە ژێر باخەڵیەوە، دیسانەوە، وەک سەدان نیوە شەوی تر، زەردەخەنەیەکی درۆزنانەی خۆشحاڵی دەکات و ڕوو لە هەموو برادەرانی سەرمێزەکە دەکات و دەڵێ: «دەی جەماعەت، شەوتان شاد. لەوانەیە تا سبەی شەو. جارێ بەدوعا»، ئنجا لە چێشتخانەکە دەچێتە دەرەوە و لەسەر شۆستەکە سواری ئوتوومبیلە فۆکس فارگۆنەکەی خۆی دەبێت و دەڕوا بەرەو هۆتێلەکەی، ئەو هوتێلەی کە نیوەشەوێک لە سەعات یەکی شەوەوە تا سەعات هەشت و نیوی بەیانی کاری تیا دەکا، دوای ئەوەش کە ئیتر بەرەبەیان کاری تەواو دەبێ، هەڵتەک هەڵتەک بەرەو ماڵەوە دەگەڕێتەوە بەرەو ژوورە





بچکۆلانە پرژ و بڵاوەکەی – لە حەوتەمین قاتی ئاپارتمانێکی کۆن لە «ژاڤێل»، بۆ ئەوەی لە ماڵەوە تا دەوروبەری کاتژمێر چوار و پێنجی ئێوارە بخەوێت و ئێوارەش ئیتر «بەتایبەتی ئێوارانی شەممە و یەکشەممە»، بە تەنیا، بەرەو شەقامە ڕەنگاوڕەنگەکەی «سانت دونیس» دەکەوێتە ڕێ، لەوێ، بەدەم پیاسەوە، بە درێژایی کۆڵان و شەقامە درێژە ڕەنگاوڕەنگەکەی سانت دونیس، چاو بە یەکە یەکەی ئافرەتە سۆزانییە نیوە ڕووتەکاندا دەگێڕێ، بەڵکو ئافرەتێکی چاو و برۆ ڕەشی خرپنی «ڕۆژهەڵاتییانەی» بە هەرزان دەست بکەوێت و چەند سەعاتێکی خۆشی لەگەڵ بەسەر ببات، شەو درەنگانیش، ئیتر ڕەتاو، داهێزراو، دیسانەوە خۆی دەگەیەنێتەوە هەمان ئەم چێشتخانەیەی ئێرە بۆ ئەوەی دیسان بەدەم شەراب خواردنەوە، بەدەم خواردنی دۆڵمە یا ساواری کوردەوارییەوە، لەگەڵ برادەرە کوردەکانی، «دابنیشن و تێر قسەی خۆش بکەن و شەوێکی کوردی خۆش بەسەر ببەن». ئەوەیە، ئەم زەلامە، هەموو ژیانی خۆی، هەمیشە بەم شێوەیە بەسەر دەبات.

دختۆر نووری لەناکاو ڕووی پرسیاری لێ کردم:

– باشە، دارا، ئیسپانیا بۆ تۆ ڤیزەی ناوێ؟

لەناو قۆزاغەی بێدەنگی و ئەندێشەی خۆمدا ڕاچڵەکیم، وتم:

– پرسیومە، نایەوێ.

نەریمان زەردەخەنەیەکی لەژێر سمێڵەکانیەوە کرد، دەم و دەست سەیرێکی کردم و پێکەنی، وتی:

– بۆ دارا، تەنیا «ئیتالیا» ڤیزەی دەوێ.

هەرکە نەریمان وای وت، سیامەند و خەلیل و شازاد یەکسەڵەف دەستیان کردە قاقای پێکەنین. دختۆر نووری و بەهجەت وەلی پێ نەدەکەنین. دیار بوو ئەوان ئاگاداری چیرۆکەکەم نەبوون، جارێ نەیانبیستبۆوە. منیش ئیتر، بێ ئەوەی بەم پێکەنینە سوعبەتاوییەیان تەریق ببمەوە، دەم و دەست ئەو یادگارە شیرینەی کە ئەوان قاقا پێیی پێ دەکەنین، وەک ئەلبوومێکی ڕەنگینی بۆندار، یەکەیەکەی لاپەڕە جوانەکانی، لەبەر چاومدا هەڵدەدرانەوە. زەردەخەنەیەکی ئارامیبەخشی پڕ لە تاسووقی، لەناو برادەرەکانمدا، خستە سەر لێوەکانمەوە. من خۆم ڕووداوەکەم بۆیان گێڕابۆوە:

هاوینی پار بوو، چووبوومە ئیسپانیا. لە ئیسپانیا، دوای بەسەربردنی دووهەفتەی خۆش لە بەرشەلۆنە، خەریک بووم دەگەڕامەوە پاریس. شەمەندەفەرەکەم پێش ئەوەی بگاتە سەر سنووری فەرەنسا، لە یەکێک لە شارۆچکەکانی سەرسنووری دیوی ئیسپانیا، لە portbou، رای گرت. من لەناو شەمەندەفەرەکە دانیشتبووم و جگەرەم دەکێشا. کچێک، لەگەڵ ژنێکی پیر کە دیار بوو لە وێستگەی ئەو شارە ئیسپانییەوە سەرکەوتبوونە ناو شەمەندەفەرەکە، هاتنە ناو هەمان فارگۆنەکەی منەوە و

لەتەنیشت پەنجەرەکەی دەستەڕاستی منەوە دانیشتن. کچەکە، هەرکە دانیشت و دانەنیشت (خەریک بوو جگەرەیەکی لە پاکەتەکەی دەردەهێنا) لەناکاو، کە چاوی بە من کەوت، وەک ئەوەی برایەکی چەند ساڵ ونبووی سەرگەردانی خۆی بینیبێتەوە، بە نیگایەکی گەشی پاک، پڕ لە پەرۆشی، پڕ لە خۆشەویستییەکی گەرم و قووڵ، جگەرەکەی لەدەست وشک ما. قەیرێک هەر سەیری کردم... پاشان شڵەژا، چاوی داگرت.

من دوای ئەوە نازانم بۆچی، یەکسەر حەزم کرد بگریم. نازانم لەو کاتەدا، ئەو هەستە تەڵزماوی و لێوانلێوی ئاسودەیی و هەم فیگارییە چی بوو، کە سەرتاپای ڕۆحمی لە ماوەی چرکەیەکدا داچڵەکاند! ڕووم کردە پەنجەرەکە، کەوتمە بیرکردنەوە. بە خۆمم وت: «سەیرە»، «ئەم کچە کێیە!»، «بۆ کوێ دەڕوا؟»، «ئەم پیرەژنە کێیە لەگەڵی؟».

شەمەندەفەرەکە بەڕێ کەوت. من ڕووم لە پەنجەرەکەی خۆم وەرگێڕا؛ بەشێوەیەک کە نەمدەتوانی خرۆشان و داخورپانی ڕۆحم بشارمەوە، سێرەم گرتەوە لای ئەوان. ئەویش لە هەمان کاتدا نیگای خۆی لەسەر پیرێژنەکە گواستەوە و بە دزە نیگایەک سەیرێکی دیکەی منی کردەوە.

ئەمجارەیان، ڕاستییەکەی، نەمدەتوانی تەماشای چاوەکانی بکەم. هەستم کرد ئەویش نەختێک شڵەژا.

خێرا (وەک ئەوەی پێی خۆش نەبێ کە پیرێژنەکە هەست بە شڵەژانەکەی بکا) سەیرێکی بەرامبەر خۆی و پیرێژنەکەی کردەوە و پاشان، وەک ئەوەی فڕکەی لەناکاوی پەپوولەیەکی بینیبێ، ئاوڕی بۆ لای دەرەوە، بۆ لای پەنجەرەکە دایەوە. بینیم: دڵخۆشی و ئاسودەییەکی پەمبە کەوتبوونە سەر ڕوخساری، نیوە زەردەخەنەیەکیش لەسەر لێوەکانی. قەیرێک هەروا مایەوە، ڕووی لە پەنجەرەکە وەرنەگێڕا. پاشان لەناکاو، بێ ئەوەی سەیرم بکا و بمبینێ، وەک ئەوەی هەستی بەوە کردبێ کە من هێشتا هەر تەماشای دەکەم، شڵەژا. لە ئاکامدا سەری هەڵبڕی، بە دوو چاوی پڕ لە شەرم و ئەوین و پەرۆشییەوە سەیرێکی کردم. ئینجا وەک ئەوەی لە شتێک دڵنیا بووبێت، بە ئارامی و کەمێکیش بە شەرمەوە سەری خۆی داگرت.

من ئیتر ماوەیەکی زۆر، کە نیگای گەرم و پڕ لە پەرۆشی و بانگی چاوەکانی، پەیتا پەیتا گیانیان پڕکردم لە حەز و شەیدایی، خەریک بوو لە هەمان کاتدا شەپۆلی هەستێکی فیگاری و غەمێکی قورسی بێ ناونیشان لە ناخمدا سەری دەکرد.

لەناکاو، نازانم لەبەرچی، چەند دڵۆپە فرمێسکێک زانە قووڵاییی چاوەکانمەوە و هێور هێور بەسەر ڕوومەتمدا هاتنە خوارەوە.

بێ ئەوەی تەماشای بکەم، هەستم دەکرد و دەمزانی کە تەماشام دەکا. کە سەرم هەڵبڕی، چاوی بە فرمێسکەکانم کەوت. بینیم لەناکاو ڕوخساری گۆڕا بوو،





حەپەسانێکی تێکەڵ بە هەستێکی غەمگینی لەسەر نیشت. من بە دوو چاوی فرمێسک تیا قەتیسماوی خۆمەوە سەیریم دەکرد. ئەویش (کە چاوەکانی هێندە پاک و گەش و ڕوون بوون، نەدەکرا ئەو هەستی خۆشەویستی و میهرەبانییە گەرمەیان تێدا ون ببێ ) بە سەرسوڕمان و حەپەسانێکی بێدەنگ داچڵەکابوو، سەیری کردم.

لە شڵەژانی خۆیدا، خێرا سەیرێکی بەرامبەر خۆی – پیرێژنەکەی کرد، ئینجا لەناکاو هەڵسایەوە، بێ ئەوەی سەیری هیچ شتێک بکا، بەپەلەپڕووزێ لە کورسییەکان هاتە دەرەوە. بە ڕێڕەوەکەی نێوانماندا، بەرەو دەرگای پشتەوەی من، بە هەنگاوی توند و خێرا ڕێگای گرتەبەر. ڕۆیشت. لە دڵی خۆمدا، وتم: «دەچێتە تەوالێت».

کە ڕۆیشت، ماوەیەکی یەکجار زۆری، نزیکەی دە دەقیقەی پێ چوو. لەو ماوەیەدا پیرێژنەکە دوو جاران لەسەر کورسییەکەی خۆیەوە، بەلای دەستە چەپەوە خۆی لار دەکردەوە و سەیری ناو دەرگای فارگۆنەکەی دەکرد (ئەو ڕێگایەی دەچۆوە سەر تەوالێتەکە ).

بە خۆمم دەگوت: «لەوانەشە چووبێتە قاوەخانەکە و بیەوێ منیش بچم، لەوێ هەر هیچ نەبێ بتوانین دوو قسە بکەین».

دەمویست بچم، بەڵام لەوە دەترسام پیرێژنەکە هەستی بە نێوانما کردبێ، یان ئەویش بە دوامەوە بێتە قاوەخانەکە. ئەم هەڵوێستەم بە جوان و گونجاو نەدەزانی. لە کۆتاییدا وتم: «دەچم». خەریک بوو هەڵسم، دەنگی کردنەوەی دەرگای فارگۆنەکە و پاشانیش دەنگی هەنگاوەکانی، خاویان کردمەوە.

هات دانیشتەوە. من بە غەمگینییەوە، لە پەنجەرەوە سەیری دەرەوەم دەکرد. ئەویش لەگەڵ پیرێژنەکە، بە دەنگێکی زۆر نزم و نادیار، بەڵام دەمزانی بە ئیسپانی قسەدەکەن، ورتە ورتیان بوو.

پێش ئەوەی بگەینە شارۆچکەی Cebere، ئەو شارۆچکەیەی دووایین شارۆچکەی سەرزەمینی ئیسپانیا بوو، سنووری هەر سێ وڵاتی ئیسپانیا و فەڕەنسا و ئیتاڵیای بە یەکتری دەبەستەوە؛ دڵەکوتێ و نائارامیەکی کوشندە چنگی لە ڕۆحم گیر کردبوو، بەخۆمم گوت: «ئێستا ئەوەتا وا گەیشتین»، «بەڵام ئێمە لەسەر سنووری سێ وڵاتداین»، «ئەم کچە بەرەو کوێ دەڕوا؟».

ئەم پرسیارەم ئاراستەی خۆم دەکرد و بە سۆزێکی غەمگین و پڕ لە پەرۆشیەوە سەیریم دەکرد. ئەویش چاوەکانی گەش، پاک، ڕووناک «بەڵام ئەمجارەیان غەمێکی قووڵیان تێ کەوتبوون» سەیری بنمیچی شەمەندەفەرەکەی دەکرد، بەبێ ئەوەی هیچ وەڵامێکم بداتەوە.

شەمەندەفەرەکە خەریک بوو ڕای دەگرت. لەناکاو هەردووکیان پێکەوە هەڵسانەوە، کەوتنە خۆکۆکردنەوەی خۆیان. جار جار بە نیگایەکی مەلوول، بێدەنگ، نیگایەکی

دەکردم، وەک ئەوەی بیەوێ بۆ دوایین جار بەشێک لە ڕۆحم، چلێک لە بوونم بە نیگای خۆی دەسکەنە بکات و لەگەڵ خۆی ببا.

من دەبوایە هەڵنەستمەوە، دەبوایە لەناو هەمان شەمەندەفەرەکەی خۆم بمێنمەوە و چاوەڕێ بکەم بۆ ئەوەی شەمەندەفەرەکە پێنج دەقیقەی تر بەڕێ بکەوێتەوە: حەوت سەعاتی دیکە دەگەیشتمەوە ماڵەوە، لە پاریس. بەڵام کە بینیم ئەوان ڕۆیشتن، ئیتر منیش یەکسەر بەپەلە خۆم کۆکردەوە و جانتاکەم گرتەدەست، بەدووای ئەواندا دابەزیم.

مانگەشەوێکی خۆش بوو. کزەبایەکی فێنکی دەهات. لەسەر شۆستەکەدا، من لە دوواوە و ئەوان لە پێشەوە، ژن و پیاوێک و چەند منداڵێک کەوتبوونە نێوانمانەوە، لەڕیزی پێشەوەی هەمووشماندا، حەشاماتێکی زۆر لە خەڵک، لەناو تەم و تاریکایی سەر شۆستەکەدا ڕیزەیان بەستبوو کە بە ڕێڕەوەکەدا بگەنە بەردەم پۆلیسەکانی بەردەرگا، بۆ ئەوەی پەساپۆرتەکانیان پیشان بدەن و بتوانن بچنە ناو خاکی فەرەنساوە، یانیش لەوێوە هەریەکەیان بەرەو وڵاتێک، بەرەو مەنزڵگایەکی دیکە سەفەر بکا.

من تا ئەوکاتەی لە پیشاندانی پەساپۆرتەکەم بە پۆلیسی سەر سنوور بوومەوە، هەر خەمی ئەوەم بوو کە هێندە لێییان دوور نەکەومەوە. کە گەیشتمە ناو ساڵۆنەکەش، ئیتر خەڵک هەر بابا بوو ڕایان دەکرد بەرەو شوێنی پارە گۆڕینەوە، بەرەو پرسگا، بەرەو حانووت، یانیش زۆر بە پەلەتر دادەبەزینە خوارەوە و دەچوون هێڵی شەمەندەفەرەکەی خۆیان بدۆزنەوە.

من چاوم هەر بە لای ئەوانەوە بوو. لەناکاو دیتم هەردووکیان پێکەوە دابەزینە خوارەوە، بۆ ژێر زەمینەکە. ئیتر منیش بەدووایانەوە دابەزیم. لەژێر زەمینەکەدا توانیم بەپەلە خۆم بگەیەنمە لای هەمان پێپیلکەکەی ئەوان و، سەرکەوتم.

ئەوان لەسەر شۆستەی شەمەندەفەرەکەدا، لەناو تەم و تاریکایی نیوەشەوەدا، وەک دەیان خەڵکی تر - کە هەر بابا بوو ڕایان دەکرد و خۆیان دەگەیاندە ناو شەمەندەفەرەکە - چاویا دەگێڕا و بە پەلەپڕوزێ کەوتبوون. لەئاکامدا، بەسەر پێپیلکەی یەکێک لە فارگۆنەکانی شەمەندەفەرەکە کەوتن. خۆیان کردە ژوورەوە.

منیش لە نزیک دەرگای فارگۆنەکەی تەنشت ئەوان، هەر لەسەر شۆستە ڕاوەستابووم. سەرم بەرزکردەوە، ڕووم کردە گەنجێکی مووزەردی سەروقژ بژ، کە سەری خۆی لە پەنجەرەی شەمەندەفەرەکەوە دەرهێنابوو و هەوای پاکی نیوە شەوی هەڵدەمژی. بەپەلە بە زمانی فەرەنسی لێم پرسی:

- ئەو شەمەندەفەرە بەرەو کوێ دەڕوا؟

باش تێم نەگەیشت، بەڵام بە دەنگێکی بەرز، بەپەلە وەڵامی دامەوە:

-میلانۆ، میلانۆ.

کە ئەمەی وت، من گەیشتبوومە سەرسێیەم چینی پێپیلکەی شەمەندەفەرەکە،





سەرکەوتم.

دووای ئەوە، بە ڕێڕەوی ناو شەمەندەفەرەکەوە خۆم گەیاندە ناو هەمان فارگۆنەکەی ئەوانەوە. لەناو فارگۆنەکەی ئەواندا، تەماشام کرد دیتم: هەردووکیان، لەوبەری فارگۆنەکەدا، لەناو ڕێڕەوەکەدا، خەریک بوون جانتا و کەلوپەلەکانیان دەخستە ژوورەکەیانەوە. ئیتر بەیەکجاری دڵم ئاوی خواردەوە و سیچەنم گرت. شەمەندەفەرەکە کەوتە جووڵە جووڵ، خەریک بوو بەڕێ دەکەوت. لە دڵی خۆمدا گوتم: «تەواو ئیتر، دەچمە میلانۆ» ، «ناچمەوە پاریس» .

زۆر زەحمەت بوو بتوانم بەناو ڕێڕەوی فارگۆنەکەدا تێپەڕ بم، چونکە ڕێڕەوەکە پڕبوو لە خەڵک. ئاورم بۆ لای هەر ژوورێکیش دەدایەوە، خەڵکیان تیابوو، پەردەکانیان دادابووەوە و گڵۆپەکانیان کوژاندبۆوە. تەماشام کرد: «کچەکە» ، لە بەردەرگای ژوورەکەی خۆیاندا راوەستابوو، لە دوورەوە، بەپەلە، بەڵام زۆر بە شاگەشکەیی و دڵخۆشییەوە، دەستی راستی بەرز کردەوە: یەک دوو جاران بەدڵخۆشی و پێکەنینەوە دەستی راوەشاند و چووە ژوورەوە.

بەم ئاخێزەی ئەو، خەریک بوو لە خۆشیان باڵ بگرم. هەتا بلێیی گەشامەوە. «بەڵام» بە خۆمم گوت «باشە، من بلیتی بەرەو ئیتالیام نەبڕیوە!» ، «پەساپۆرتەکەشم، پەساپۆرتی پەناهەندانی نەرویجییە و لە فەرەنسا دەژیم، بۆ ئیتالیا ڤیزەی دەوێ» ، «چی بکەم؟» . لەم بیرکردنەوەیەدا بووم، لەوسەری فارگۆنەکەوە شەپقەی پۆلیسێکم بینی. داچڵەکام. یەکسەر رووم وەرگێڕا، بەرەو دوواوە گەڕامەوە. چووم لە داڵانەکەی بەردەم ئاودەستخانەکە راوەستام. بیرم لەوە دەکردەوە، کە بۆ ماوەیەکی کورت، تا ئەوکاتەی پۆلیسی سنوور» لە داواکردنی پەساپۆرت تەواو دەبن، بچم خۆم لەناو ئاودەسخانەکە بشارمەوە.

دڵم بە تەپە تەپ کەوتبوو. لەوکاتەدا یەکسەر مەوجوود و ئەسعەدم بیر هاتەوە، کە وەختی خۆی، لە نامەیەکیاندا بۆیان نووسیبووم، گوایە کاتێ ویستوویانە لە ئەڵمانیاوە خۆیان بگەیەننە هۆڵندە، هیچ پەساپۆرتێک، هیچ رەگەزنامە و هیچ ناسنامەیەکیان پێ نەبوو کە نیشان بدا سەر بە وڵاتێک یان دەوڵەتێکی ئەم زەمینەن، ئیتر لەناو شەمەندەفەراندا، لەناو پاپۆڕاندا، هەمیشە خۆیان «لەناو ئاودەسخاناندا» شاردۆتەوە، تا گەیشتوونەتە ئەمستردام و لەوێ داوای مافی پەناهندەییان کردووە.

دەستم نایە سەر دەستووی ئاودەستخانەکە، دەمویست دەرگاکە بکەمەوە و بچمە ژوورەوە، بینیم پۆلیسێک لە ئاودەسخانەکە هاتە دەرەوە، بێ یەک و دوو، یەکسەر داوای پەساپۆرتی لێ کردم.

لەوە بەدووا، هەستم کرد کە تازە ئیتر بێهودەیە! سەعاتێکی ڕەبەق لەناو شەمەندەفەرەکەدا، لە ژووری حجزکراواندا، لەسەر کورسییەکی قەدیفەی شین، لە

تەنیشت پۆلیسێک، کە بەدرێژایی ئەو ماوەیە، بێدەنگ، هەر خەریکی نوستن بوو.. چاوەڕێم کرد! تا گەیشتمە یەکەم شاری سەر سنووری ئیتالیا. ئیتر لەوێش، بلیتێکیان پێ کڕیم و ڕێگا و ڕێگا بەرەو پاریس گەڕامەوە).

سیامەند هەر پێدەکەنی، لە کۆتایشدا بەدەم پێکەنینەوە وتی:

– تۆ دەبووایە پێش ئەوەی بچیتە بەرشەلۆنە، لە پاریس بیرت لە ڤیزەیەکی ئیتالیا بکردایەتەوە، کوڕی باش! نەریمانیش کە لە پێکەنینە درێژخایەنەکەی وەستا، بەدەم کۆخە کۆخی دوای پێکەنینەکەوە، وتی:

– لە دینت بەم، دارا.

ئینجا، سیامەند، کە هەمیشە لە هەموو برادەرەکانم زیاتر حەزی دەکرد بزانێ کە بۆچی ئەو سەفەرەی بەرەو بەرشەلۆنە دەکەم، پرسی:

– باشە، دارا، توو شەرەف، تۆ لەپێناو هەمان ئەو کچە ناچیتەوە ئیسپانیا؟

منیش وتم:

– کام کچ؟

بە چەناگە هێمای بۆلایەک کرد و بە زەردەخەنەوە وتی:

– کچی ناو شەمەندەفەرەکە، کچە ئیسپانییەکە؟

دختۆر نووری کونجکۆڵانە وەدەنگ هات:

– ئێ، دە – دەی، بۆ کچە ئیسپانییان دەچێتە ئیسپانیا! نەریمان پرسی:

– بەڵام سەیرە! ئایا هەمان کچە، دارا؟ ئەو کچەی ناو شەمەندەفەرەکە ئیسپانی بوو؟

من خەریک بووم بڵێم: بەڵێ. لەم کاتەدا، شازاد، کە لەسەرخۆ قەڵەمی بە کاغەزێکی سەر مێزەکە دادەهێنا، پشتی لە کورسییەکەی کردەوە، وتی:

– دارا لە «جوانی» زیاتر، بە دوای هیچ شتێکی تردا ناگەڕێ...

بەهجەت وەلی، ڕووی لە شازاد کرد:

– دە بیبڕەوە، شازاد، دیسان!

– بە «جوانی» سەغڵەت دەبی، مامۆستا؟

ئەویش بە هەمان تەوس و تانووتەوە، بەڵام زۆر بەنەرمی، وتی:

– کاکە گیان، تۆ شاعیری، خۆ ئەو شاعیر نییە!

شازاد وتی:

– خۆ هەر کەسێک، با شاعیریش نەبێ، حەزدەکا لە غەوغای ژیانی پاریس دوور





بکەوێتەوە و بچێ لە باوەشی سروشت ڕۆحی خۆی بە جوانی و پاکیی سروشت زاخ بداتەوە. سەفەر خۆشە.

بەهجەت وەلی، کەمێک نەرم بۆوە، وتی:

– باشە، قەیناکە: سەفەر و هەموو ئەم شتە قۆڕانەی تریش، بەڵام «جوانی».. تۆ هەمیشە ئەم وشەیە بە زارتەوەیە. مەبەستت چییە لە «جوانی»؟

شازاد وتی:

– ئەوەیە، ئیتر، ئەوکەسانەی کە بەدووای پارە و «شتە قۆڕەکانی» ژیان کەوتوون، هەرگیز ناتوانن لە «جوانی» تێ بگەن.

بەهجەت وەلی دەنگی کەمێک بەرز کردەوە:

– ئێوەش، ئێوەی شاعیران، کە ئیتر ناتوانن خۆتان لەگەڵ شارستانییەت و ژیانی تازە ڕابهێنن، هەمیشە پەنا دەبەنە بەر «جوانی» و «بەهەشتی ونبوو» و ئەم شتە قۆڕانە.

نەریمان، بێ ئەوەی ڕوو لە بەهجەت وەلی بکا، بە قسە هات:

– «جوانی» بۆچی شتی قۆڕە، باوکم؟

بەهجەت وەلی، ڕووی هێشتا لە شازاد بوو، وتی:

– ناویش لەم شتە قۆڕانە دەنێن «هونەر» یان «شیعر».

ـــ من قسەم نەما..

لەو دەمەدا خەلیل بواری نەدا چیتر هیچ کەسێک قسەی تر بکا، حەزی نەکرد گفتوگۆکە زیاتر پەل بهاوێ و هاوڕێکان بکەونە دەمەقاڵێی توند و تیژەوە، وتی:

– تکایە دە وازبێنن، باوکم! بەخوا ئیتر هەر ئەوەیە: لەدەست مشکەکانی ژوورەکەی خۆی، پاریس بەجێ دەهێڵێ.

## 5

لە تووڵووز، دوای ئەوەی لە هوتێلەکە دووشێکم وەرگرت و چووم لە ژوورەکەمدا پشوویەکی کورتم دا، یەکسەر بۆرد و ستاند و کەلوپەلەکانی ڕەسم کردنم خستنە سەر شان و بەرەو ناوەڕاستی شار بەڕێ کەوتم.

ئەو ئێوارەیە لە تووڵووز، لەناو سەنتەری شارەکەدا هێندەی گەڕام و سووڕام و چاوم گێڕا، هیچ مەیدانێک، هیچ شوێنێکی ئاوهام نەدۆزیەوە کە نیگارکێشەکان – وەک ئەوەی لەپاریس هەیە – تێیدا کۆببنەوە و خەڵکیش ڕاهاتبن ڕووی تێ بکەن و داوای پۆرترێت دروستکردنیان لێ بکەن.. تەنانەت هیچ نیگارکێشێکم لە هیچ قوژبن و

مەیدانێکی شارەکەدا چاو پێ نەکەوت. لە ئاکامدا چووم لەژێر سێبەری بنە درەختێکی گەورە و سەرکەشی مەیدانی (ویلسۆن - wilson) کە یەکێکە لە مەیدانە هەرە ڕازاوە و بەداروبار و قەرەباڵغەکانی شاری توولۆوز، تەختە ڕەسمەکەم هەڵدا و یەکێک لە پۆرترێتە کۆنەکانی لە پاریس کردبوو، هەڵواسی.

جگەرەیەکم داگیرساند، لە دڵی خۆمدا دەمگوت: «پێش ئەوەی بەرەو ئیسپانیا بەڕێ کەوم، تۆ بڵێی بتوانم لێرە چەند پۆرترێتێک دروست بکەم و هەندێ پارەی دیکەم دەست بکەوێ؟».

لەتەنیشت ستاندەکەم، لەسەر کورسی - بەردێکی بچکۆڵە دانیشتبووم. بەدەم گوێگرتن لە دەمبەدەمب و ئاهەنگی دڵبزوێنی چەند گەنجێکی شەپرێوی مەکسیکی کە لەوبەرمەوە بۆ پارە پەیداکردن لەناو خەڵکەکە سازیان کردبوو، تەماشای پەیکەری بەرزی ئەو شاعیرەم دەکرد کە لە ناوەڕاستی مەیدانی ویلسن Wilson داندرابوو. پەیکەری شاعیرەکە، لەژێری نووسرابوو گودوولی Goudouli: دەستی ڕاستی لەسەر چۆکی دانابوو، بە دەستەکەی دیکەشی کتێبێکی بە دەستەوە گرتبوو، زەردەخەنەیەکی شاعیرانە لەسەر لێوەکانی بوو. یەکسەر شازادم بیر هاتەوە. ئەگەر لێرە بووایە، دەیگوت: «ئەمەش بەدبەختێکی دیکەی هاوڕێی خۆمان».

- ڕاستییەکەت دەوێ: هونەرمەند، ئەگەر فەرەنسی بێ یان کورد بێ.. چارەنووسی هەمان چارەنووسە.

- ئێ، وایە: تۆ لە پەنجەرەی قەسرێکەوە یان لە پەنجەرەی کوختێکەوە تەماشای دەریا بکەیت.. دەریا هەمان دەریایە.

- وا نییە.

- چۆن؟

- هونەرمەندێک لە فەرەنسا لەدایک بێت، بەختەوەرترە لەچاو ئەو هونەرمەندەی لە پاکستان لەدایک دەبێت.

خەلیل هەڵی دایە، گوتی:

- باشە، خۆ، دارا وەک ئەوە وایە لە فەرەنسا لەدایک بووبێت، ئەم بەدبەختی و مەرگەساتییە چییە کە بەردەوام هەستی پێ دەکا؟

- هونەرمەند سەر بە هەر نەتەوەیەک و لە هەر سەردەمێکدا بێت، تەنیا بەدوای یەک شتدا دەگەڕێ: جوانی... یان ڕاستتر: دروستکردنی جوانی. تەواو.

- کەواتە، تۆ دەتوانی لە کەرکووک، لە مۆنماخت، لە قەندەهار، لە لەندەن.. لە هەموو شوێنێکدا ئەو جوانییە دروست بکەیت!

- وایە.





- ئەدی، کەواتە، ئەو مەرەقەی تۆ چییە: سانتیاگۆ، سانتیاگۆ، سانتیاگۆ..؟

هێشتا جگەرەی یەکەمم نەکوژاندبۆوە لەناکاو پیرەژنێک شیرازەی خەیاڵی پچڕیم. دەستی منداڵێکی گرتبوو، سەیری پۆرترێتی هەڵواسراوی سەر ستاندەکەمی دەکرد، بە زەردەخەنەیەکی گەش و پڕ لە میهرەبانییەوە لێم نزیک کەوتەوە و داوای لێ کردم کە پۆرترێتێک بۆ ئەو منداڵەی دروست بکەم. ئەمە یەکەمین پۆزترێت بوو لە توولۆوز دروستی بکەم. دوای ئەویش، یەکسەر کچێک هات، پاشانیش پیاوێک...

خۆر خەریک بوو ئاوا دەبوو، تاریکایی وردە وردە باڵەکانی خۆی بەسەر لوتکەی ئاپارتمان و بانیژەکاندا، بەسەر لق و پۆپی گەڵای درەختەکاندا پەخش دەکرد. من ئاگام لە ئاهەنگ و ئاپۆڕەی خەڵکەکەی دەوروپشتم نەمابوو، لە کاتژمێر چوار و نیوەوە هەر خەریکی دروستکردنی پۆرترێت بووم. دەست و پەنجەکانم کەمێک ئازاریان دەدام و هەستم بە کەمێک هیلاکی و برسێتی دەکرد. لەناکاو لەوەدەمەی کە من تەماشای شانی مۆدێلەکەی بەرامبەر خۆمم دەکرد و خەریک بووم هێڵێکی چەماوەی تۆخ بەسەر تابلۆکەدا بکێشم، لەپشت سەرمەوە دەنگێکی ئافرەتانە رایچڵەکاندم:

- پۆرترێتێکی بەڕاستی نایاب!

ئاوڕێکم دایەوە: ئافرەتێکی سەروتەبەش پان، قژ لوولی کاکۆڵ هەندێ تاڵ تاڵ سپی، عەینەگ لەچاو. هەمان ئەو ئافرەتە بوو کە ماوەیەک پێشتر کاتێ خەریک بووم وێنەی کوڕێکی گەنجم دەکێشا، لە تەنیشتمەوە راوەستابوو جاربەجار تەماشای بزاوتی دەست و پەنجەمی دەکرد، جاربەجاریش نزیکتر دەکەوتەوە و سەری دەهێنایە پێشەوە، لە تابلۆکەی بەردەستم ورد بۆوە: فیگەر و هێڵەکانی ناو تابلۆکەمی بە ڕوخساری کوڕە گەنجەکە بەراورد دەکرد. وتم: «سوپاس».

لەدووامەوە درێژەی پێ دا:

- ئەمە یەکەمجارە بەڕاستی کە ئەم جۆرە شێوازەی نیگارکێشان دەبینم!

ڕووم لە تابلۆکەم بوو، پانتاییەکی سپیم بە سێبەری خاڵ خاڵ پڕدەکردەوە:

- ئەگەر حەز بکەی، پۆرترێتێک بە هەمان شێواز بۆ تۆش دروست دەکەم.

بێ ئەوەی ببینم، هەستم بە زەردەخەنەی سەر ڕوخساری کرد:

- باشە دەی چاوەڕێ دەکەم.

من یەکسەر لەو پێشنیارەی کردم پەژیوان بوومەوە، چونکە تابڵێی برسی و ماندوو بووم، دەبووایە دەست لە نیگارکێشان هەڵبگرم و بچم لە چێشتخانەیەک نانێک بخۆم و پشوویەک بدەم.

باش بوو، دەرەنگتر کە ئاوڕم دایەوە، ئافرەتەکە لەو ماوەیەی خەریک بووم تابلۆکەی بەردەستم تەواو دەکرد لەو ناوە نەمابوو. چووبوو لەسەر یەکێک لە کورسییە درێژەکانی

ناو باخچەکە، لەژێر تیشکی سەوزی عەلەتریکێکی بەرز دانیشتبوو، کتێبێکی دەخوێندەوە.

زوو بۆرد و ستاندەکەم لێک نان، کەلوپەلەکانی دیکەشم کۆکردنەوە و لەشێوەی جەنتایەکی پڕی درێژکۆلانە – کە لە بالینگانی دەرۆزەکەرێکی ئەورووپی دەچوو – لەژێر درەختەکەدا دامنان. هێشتا مامبوو بگەمە لای ئافرەتە عەینەگ لەچاوەکە، تەماشایەکی کردم و سەری لار کردەوە، ڕووانییە شوێنی تەختەڕەسم و ستاندەکەم. بە سەرسامییەکی گلەییباری دۆستانەوە، وتی:

– دەبینم داتخست؟

خۆم گەیاندە سەر کورسیەکە، ڕەتاو، وەک ئەوەی لە شەڕێکی سەخت گەڕابێتمەوە، لەتەنیشتیەوە، پالّ کەوتم. ئافرەتە عەینەگ لەچاوەکە پشتی لە کورسییەکە کردەوە، وتی:

– من تەنیا بۆ ساتە وەختێک پشوویەکم دا. دەمێک بوو بەپێوە وەستابووم.

بە شێوازێک کە بتوانم هیلاکی و ماندوویی خۆم پیشان بدەم، هەروەها بە زەردەخەنەیەکی دۆستانەی داوای لێبوردن کردنەوە، پێم وت:

– ئێستا تابلّێی ماندووم. دلّنیام ئەگەر ڕەسمیشم بکردیتایە، نەمدەتوانی جوانیت بەو شێوەی هەیە بگوازمەوە..

عەینەگەکەی لەچاو کردە:

– قەیناکە.

ئنجا وتی:

– مەبەستی من، زیاتر شێوازەکەت بوو، شێوازی نیگارکێشانت.

کتێبەکەی خستە ناو جەنتاکەیەوە و لەناکاو، وتی:

– لەوە دەچێ ئەم شێوازەی ئێستات، لە تابلۆکانیشتدا بەکاربهێنی؟

وتم: «بەلّێ. بەم شێوازە ڕاهاتووم و زۆر حەزی لێ دەکەم».

وتی:

– هەرکە یەکەم جار پۆرترێتی کوڕە گەنجەکەتم بینی، شێوازەکەت چووە دلّمەوە و شتێک هات بە خەیالّما. بیرم بۆ شتێک چوو.

– چی؟

کەمێک ڕاما. دیار بوو دەیویست سۆراغی شتێکم لێ بکا، دوودلّ بوو. وتی:

– تۆ خەلّکی تولّووز نیت.

وتم: «نەء».





تەماشای قەلّەمەکەی دەستیم دەکرد، وەک ئەوەی خۆی ئامادە بکات هەڤپەیڤینییێکی ڕۆژنامەنووسیم لەگەلّ ساز بکات، وتم:

– من کوردی عیراقم، لە پاریس دەژیم. ڕەسم دەکەم و کاری هونەریی دیکەش دەکەم.

– نەخش و نیگاری ناو کتێبان.. کارت تێدا کردوون؟

هەندێک بێباک وتم:

– نەمکردۆتە پیشەیەک، بەلاّم چەند جارێک بۆ هاوڕێ نووسەرەکانی خۆمم کردوون.

هەردوو دەستی خستە سەر جەنتاکەی سەر چۆکی:

– من سیناریۆ و ڕۆمان دەنووسم.

– بەلّێ.

– پێویستیم بە هەندێ وێنە و نیگاری جوان هەیە، دەمەوێ لەگەلّ ئەو ڕۆمانەی خەریکە ئێستا چاپی دەکەم بلاّویان بکەمەوە.

من دەمودەست لای خۆمەوە پرۆژەکەم بەگەن کرد. لە دلّی خۆمدا وتم «ئەگەر تەنیا پازدە وێنەی بۆ بکەم، ئەوا بەلای کەمەوە، لە دوو هەزار فرەنک کەمترم ناداتێ». وتم:

– چەند وێنەت دەوێ؟

بیرێکی کردەوە:

– دە دووازدە یەک.

گورج هەلّسامەوە سەرپێ، زەردەخەنەیەکم بۆی کرد، وتم: «باش».

لە چێشتخانەیەکی نزیک مەیدانی ئێسکیغۆل، بەرامبەر یەکتر، تازە لە خواردن ببووینەوە. ئەو ریکاردێک، منیش پەنەشەیەکم لەبەردەم بوو.

ئۆریانا ئێرنۆ، ئاسوودەیی لەسەر لێو، بێدەنگ، تەماشای ڕێبوارەکانی دەرەوەی دەکرد، منیش بە دزەنیگاوە تەماشای چەماوەیی شان و مل و گەردەنیم دەکرد کە پاشماوەی جوانییەکی کۆن و ماندوویان پێوە دیار بوو.

ئۆریانا، وەک لەسەر بەرگی کتێبێکی بلاّوکراوەی خۆیدا– کە لە کاتی نانخواردن پیشانی دام – نووسیویەتی کە پازدە سالّە لەگەلّ «کۆمەلّەی خاچی سوور» لە شاری توولّووز کاردەکات و تا ئێستا دوو سیناریۆ و سێ ڕۆمانی بلاّوکردۆتەوە، لەگەلّ دەیان ڕاپۆرتی تەلەڤزیۆنی لەبارەی جەنگ. من، بەڕاستی، کە بیرم لێ دەکردەوە، بەلامەوە شتێکی گەلێک سەرنجراکێش بوو کە ئەو ئافرەتە لە ماوەی ئەو پازدە سالّەدا توانیبێتی ئەو هەموو ولاّتانەی ئەفریقای باشوور و ئاسیا و ئەمریکای لاتین بگەڕێت و ئەو هەموو ڕووداوە سەیرە جۆراوجۆرە سامناکانە ببینێت و بیەوێ بە ڕۆمان و سیناریۆ

بیاننووسێتەوە!

ئاخۆ لە ئاکامی بینینی ئەو هەموو خەڵک و ئەزموونە هەژەندانەی لەو ولاٚتانەدا بینیونی، ئێستا چۆن دەڕوانێتە ژیان؟ زۆر حەزم دەکرد لێی تێ بگەم و پرسیاری لێ بکەم:

– باشە ڕۆمانەکەت باسی چی دەکا؟

ئێستێکی کرد و کەمێک ڕاما. زەردەخەنەیەک نیشتە سەر لێوی:

– حەز دەکەم بزانم، تۆ ڕۆمان دەخوێنیتەوە؟

من کە نەمدەویست درۆی لەگەڵ بکەم، وتم: «نەء»؛ پاشان وتم:

– ئەوەندە نا.

دیار بوو ئەزموونی نووسینی زۆر بوو، وتی:

– دەزانی؛ ڕۆمان وەک نیگارکێشان نییە.. ڕۆمان ناتوانێ باس تەنیا لە یەک بابەت بکا.

بە وردی گوێم لێی راگرتبوو.

– تۆ پرسیارم لێ دەکەی: رۆمانەکەم باسی چی دەکا؟ ڕۆمان هەمیشە لە جیهانێکی سەرتاپایی دەدوێ، لە هەموو دنیا و ژیان و لە هەموو شتەکان دەدوێ لە یەک کاتدا، رووانینێکی هەمووانی بۆ هەموو ژیان و دنیای ئەمڕۆ پێکڕا پێشچاو دەخات. ڕۆمان، کەواتە لە هیچ بابەتێکی دیاریکراو نادوێ، بەڵکو ڕوانینێکە.

وتم: مەبەستت لە ڕووانین چییە؟

– چۆنیەتی سەیرکردنە ژیان. بەکورتی.

کەمێک بیرم کردەوە، وتم:

– کەواتە، ئەمە لە ڕۆماننووسێکەوە بۆ ڕۆماننووسێکی دیکە دەگۆڕێ.

وتی: بەڵێ، هەر ڕۆماننووسێک ڕووانگەی تایبەتی خۆی هەیە بۆ سەیرکردنە ژیان.

نەختێ ڕاما. ئینجا دەستی بۆ عەینەگی سەر مێزەکەی درێژ کرد و بە نەغمەیەکی ئازاراوییەوە وتی:

– بەلاٚم واتێ دەگەم ئەمڕۆ کەم ڕۆماننووس هەن، کەم تا زۆر هەست بە لەناوچوونی مرۆڤ و بەها مرۆڤایەتیەکانی ژیانی ئەمڕۆمان نەکەن.

– چۆن؟

– ئەمڕۆ تەنانەت ساتە هەرە ئاسوودە و پڕ خۆشییەکانیش، لای هەر کەسێکی ئەمڕۆ، لای هەموو خێزانێک، لە هەموو ولاٚتێکدا تەمەنیان لە چەند رۆژێک، لە چەند هەفتەیەک، یا ئەوپەڕی لە چەند مانگێک، تۆ بڵێ لە ساڵێک زیاتر تێپەڕ ناکا.





هەستم دەکرد لە کانگای سووتاوی خۆمەوە قسە دەکا. درێژەی بە قسەکانی دا:

– ئەم خاسیەتە سامناکەی کۆمەڵگەی ئەمڕۆی مرۆڤایەتی بۆتە سروشتێک. هەر بۆیەش مرۆڤی ئەمڕۆ حەزدەکا هەتا پێی دەکرێ باوەش بە زۆرترین ژیاندا بکات و زیاترین چێژ لە ئەمڕۆدا ببینن.

– بەڵێ. بە بۆچوونی منیش: فەلسەفەی ئاسوودەیی و بەختەوەری چیرۆکێک بوو.. تەواو. بەسەرچوو.

من لەو دەمەدا بیرم لە ژیانی خێزانداریی خۆی دەکردەوە. ماوەیەک پێشتر بۆی دەگێڕامەوە کە چۆن هەر لە تەمەنی منداڵییەوە لە باوەشی باوانی بێ بەری کراوە. ئەو وەختەی تەمەنی چوارساڵان بووە، باوکی چۆتە شەڕ و شەهید کراوە، ئیتر دوای ئەوەش، دایکی بەرەو ئەڵمانیا، براکەی بەرەو ئامریکا، خوشکەکانیشی بەخۆی و مێرد و منداڵەکانیانەوە، بەرەو سوید، خۆیشی بەرەو فەرەنسا پەراگەندە بوونە؛ لە فەرەنساش چۆن تەنیا دوای ساڵێک بەسەر رابووردنی شووکردنی بە دختۆرێکی کەمبۆدی، دەوڵەتی کەمبۆدیا ئەو دختۆرەی مێردەکەیان، لەبەر ئەوەی جارێکیان بە نهێنی سنووری بڕیوە و گەڕاوەتەوە ولاٚتەکەی خۆی بۆ ئەوەی منداڵە نەخۆش و دەردەدارە پێشمەرگەکانی کەمبۆدیا تیمار بکات، گرتوویانە و گوللەبارانیان کردووە.

ئۆریانا خەریک بوو بڵێ «نەخێر..»؛ من قسەکەیم پێ بڕی، گوتم:

– ئینجا تۆ لە ڕۆمانەکەتدا چ ڕووداوێک دەگێڕیتەوە، باسی چی دەکەی؟

– من لەم ڕۆمانەمدا دەمەوێ باسی مردن بکەم.

– مردن؟

– لەناوچوونی ساتەکان، پەڕاگەندە بوونی ئاسوودەییمان؛ فەلسەفەی بەسەر چوونی ئێستامان. لەمەش گرنگتر: ئێمەی مرۆڤ لە هەمبەر ئەم واقیعەدا چی بکەین؟ چۆن بژین، هەڵوێستمان چی بێ؟

تەماشای یەکترمان دەکرد. ئەو درێژەی پێ دا:

– ئەمڕۆ مەترسیی لەناوچوون هەموو بەستێنێکی ژیان و شارستانیەتی گرتۆتەوە؛ مردن لە هەموو قوژبنێکی دنیادا هەڕەشە لە بوونی مرۆڤ دەکا.

وتم: ڕابووردنی دەقیقەیەک، سیس هەڵگەڕانی گیایەک.. ئەمانە هەمووی مردنن.

وتی: بۆیە ئیتر هیچ زنجیرە ڕووداوێکی یەک لە دوای یەک لە ڕۆمانەدا نییە.

پاشان وتی:

– تۆ جارێ ڕۆمانەکەت نەخوێندۆتەوە، بەلاٚم من دڵنیام، هەر بە خوێندنەوەی یەکەمین لاپەڕەکانی، وێنەی زۆرت لەلا دروست دەبن.

ئینجا پێکەنی، وتی:

– هەرچۆنێک بێ، وابزانم تۆ «سەبارەت بەوەی نیگارکێشی» حەز دەکەی زیاتر وێنەی جوانی و ئایدیالەکان بکێشێ.. یا نا؟!

نازانم بۆچی لەوەدەمەدا، لە ئاست ئەم پرسیارە، هەستم بە سوگوارییەک کرد، وتم:

– بەلای منەوە «جوانی» تاقە ئامانجێکە.

پێکەنی، وتی:

– «جوانی» یا «هونەر»؟

وتم: جوانی دەتوانێ ببێتە ئەڵتەرناتیفێک! هونەرمەند کە جوانییەک دەکاتە هی خۆی، ئیتر ئەم جوانییە دەبێتە ولاتی. هەرچی مەرگەسات و ناشیرینییەکی ژیان هەیە تەنانەت هەستی بێ ولاتی و ئاوارەییش، نایانهێڵێ، ڕەشیان دەکاتەوە.

بیری کردەوە، وتی:

– گوێ بگرە: جوانی شتێکە کە هونەرمەند هەرگیز ناتوانێ بیکاتە هی خۆی. ئەمە شتێکی تراژیدییە.

– چی؟

– کە هونەرمەند ناتوانێ هیچ جوانییەک بکاتە هی خۆی.

من لەم قسەیەدا هاوڕای بووم، گوتم:

– تەنیا دەتوانێ دروستی بکا!

– هەر لەم حاڵەتەشدا جوانی دەبێتە هونەر.

بەدەم هەمان زەردەخەنەی پێشوویەوە، پرسی:

– بەڕاست، تۆ باسی ئەو سەفەرەی خۆتت بۆ کردم! بۆ کام شاری ئیسپانیا دەچی؟

– سانتیاگۆ.

– سانتیاگۆ دی کۆمپۆستێللا؟

– بەڵێ!

دووای نەختێک بیرکردنەوە، وتی:

– لەسەر لێواری زەریای ئەتلەنتیکە! کۆنترین کاتێدراڵی ئەورووپای لێیە.

پێکەنیم، وتم:

– جارێ نەمدیوە.

بە کونجکۆڵییەوە لە چاوەکانم ورد بۆوە:

– من سەرنجم داوە، هونەرمەند، زۆربەیان، حەز لە سەفەر و سەرکێشی دەکەن.

منیش وتم: هەمیشە لەپێناو ئەوەیە کە بتوانن سیچەن بگرن و بحەسێنەوە.





پێکەنی، وتی:

– قەتیش سیچەن ناگرن.

وتم: هونەرمەند ئەگەر ولاتێکی هەبێ، با.. سیچەن دەگرێ.

درێژەی بە پێکەنینەکەی دا، وتی:

– دە کەواتە، قەت سیچەن ناگرێ.

وتم: بۆ؟

وتی: چونکە ئەو ولاتەی هونەرمەند دەیەوێ، ئەمڕۆ لەسەر ئەم زەمینەدا سڕاوەتەوە، بوونی نییە.

بە غەمگینیەکی قووڵەوە، وتم:

– ڕاست دەکەی، بەڵام ئەدی «جوانی»! ئەدی «هونەر»؟

وتی: مەبەستت چییە؟

وتم: هونەر دەتوانێ کە ئەو ولاتە وێران کراوە، ئەو ژیانە بەهەشتییە لەدەستچووە، تەنانەت جیهانی ئەمڕۆش سەرلەنوێ زندووبکاتەوە و بۆ هەمیشە نەمری بکات!

بیری کردەوە، وتی:

– بەداخەوە..

–چی؟

– تەنانەت هونەریش ناتوانێ هیچ شتێک زندوو ڕابگرێت! ئەمە بیرکردنەوەیەکی زۆر ئایدیالیستانەیە.

وتم: نەخێر. من دڵم تەنیا بە هونەر خۆشە. تەنیا هونەر دەتوانێ «جوانی» زیندوو ڕابگرێت و بیهێڵێتەوە!

ئۆریانا زۆر بە دڵنیاییەوە ڕژد بوو لەسەر بۆچوونی خۆی:

– هونەر تەنیا گەواهی دانێکە و تەواو.

– من پێم وا نییە؛ چونکە تۆ کاتێ جوانییەک لە تابلۆیەکدا یان لە شیعرێکدا دەردەبڕیت، ئیتر ئەو جوانییە تا هەتایە دەمێنێتەوە.

– ئەمە بینینێکی زۆر ڕۆمانسییانەیە.

– بۆچی؟

– چونکە ئەمە وات لێ دەکا تەنیا هونەرت خۆش بوێت و تەنیا بە هەوای ئایدیالیستانەی ئەو جوانییە هونەرییەوە بژیت. تۆ لەم حاڵەتەدا پشت لە جوانیی واقیع و ژیان دەکەیت و ڕوو تەنیا لە جوانیی هونەری دەکەیت!

– هەموو هونەرمەندێکی ڕەسەن وا دەکات.

– نەخێر ئەمە بینینی تۆیە. ئەم فەلسەفەیەش وات لێ دەکا کەمتر حەزبکەی تامی ژیان بکەی، کەمتر بایەخ بە ژیان و دنیا بدەیت. تۆ پێویستە هەتا پێت دەکرێ بژیت و زۆرتر و زیاتر تامی ژیان و شتەکانی دنیا بکەیت..

ئنجا دیاربوو دەیویست کۆتایی بە قسەکانی خۆی بێنێ، گوتی:

– هەر ئەمەشە یەکێک لە جیاوازییەکانی نێوان ئێمەی ڕۆژئاوایی و ئێوەی ڕۆژهەلاتی!

پێکەنیم، وتم:

– ئێمەی ڕۆژهەلاتی چۆنین و ئێوەی ڕۆژئاوایی چۆنن؟

گوتی: ئێوەی ڕۆژهەلاتی دەژین تەنیا لەپێناو ئەوەی بژین بێ ئەوەی هیچ بیربکەنەوە.

– ئەدی ئێوە؟

– ئێمەی ڕۆژئاوایی بیردەکەینەوە لەپێناو ئەوەی کە چۆن باشتر و خۆشتر بژین.

– واتە... چۆن؟

– ئێوەی ڕۆژهەلاتی دەژین؛ ئێمەی ڕۆژئاوایی بیردەکەینەوە چۆن بژین.

من هێشتا بیرم لە قسەکەی ئۆریانا دەکردەوە، گوتی:

– هەر بۆیەش لەناو هونەردا دەبینین حاڵەتەکە بەپێچەوانەیە: لەناو هونەردا، ئێوەی ڕۆژهەلاتی بیردەکەنەوە؛ ئێمەی ڕۆژئاوایی دەژین.

گوتم: حەزدەکەم مەبەستی خۆتم باشتر بۆ ڕوون بکەیتەوە:

ئۆریانا بە جەسارەتەوە هاتەوە دووان، گوتی:

– لەناو ئەدەبیات و هونەردا: ئێوە هونەر و ئەدەبیاتی خۆتان پڕدەکەن لە هەست و نەست و سۆز و باوەڕ؛ ئێمەش پڕیان دەکەین لە ژیان.

گوتم: ئەمە واتای چی دەگەیەنێ؟

گوتی: ئەمە واتای ئەوە دەگەیەنێ کە ئێمەی ڕۆژئاوایی باشتر و خۆشتر دەژین، گەرمتر باوەش بە ژیاندا دەکەین.

من دەمویست پێی بڵێم «لەوانەیە قسەکانی تۆ هەموویان ڕاست بن»:

– بەڵام بە نیسبەت هونەرمەندەوە، من پێم وایە سێ چوار ساڵێک ژیان و بینینی یەک دوو شار و تاقە خۆشەویستێک بەس بێت بۆ ئەوەی هونەرمەند هونەرێکی ڕەسەنمان پێ ببەخشێت.





ئۆریانا یەکسەر وەک ئەوەی لە قافدا گرتبێتمی، پێکەنی:

– دەبینی؟ تۆ زیاتر دڵت بە ئایدیاڵ و هونەرەوە خۆشە وەک لەوەی بە واقیع و ژیانەوە. تۆ لەناو ژیاندا و بۆ ژیان ناژیت، ناشتەوێ تام و بۆی ژیان بکەیت؛ بەڵکو دەتەوێ هەموو واتاکان و هەموو وزەی خۆت تەنیا لەو چوارچێوەیەدا چڕبکەیتەوە کە تۆ ناوی دەنێیت «هونەر». تۆ ترسنۆکیت و لەدەست ژیان ڕادەکەی...

– ڕادەکەم بەرەو کوێ؟

– نازانم... هونەرمەندی ڕۆژئاوایی ئەم ئەخلاقەی تۆی نییە.

پاشان ئۆریانا لەناکاو وتی:

– تۆ کێت لەوێ هەیە؟

وتم: لە کوێ؟

– لە سانتیاگۆ..

یەکسەر، بێ بیرکردنەوە وتم:

– خوشکەکانم، خۆیان و منداڵەکانیان، هەروەها باوکم و دایکم و براکانم...

– هەر هەموویان؟

– بەڵێ. ماوەی چەند مانگێکە پەنایان بردۆتە بەر ئەوێ.

– کەواتە لە ئیسپانیا بوونەتە پەناهەندە و تۆ دەچیت سەریان لێ دەدەی؟

– بەڵێ.

– دەبینی: تۆ پێویستیت بە ژیان و وڵاتێک هەیە. پێویستیت بە میهرەبانی و سۆزی مرۆڤ هەیە. پێویستیت بە چێژوەرگرتن لە میهرەبانی و جوانی و ئاسوودەبوون هەیە.. ئەگینا بۆچی لە پاریسەوە دەچی بۆ سانتیاگۆ؟ ئایا نەدەکرا ئەو خۆشەویستی و جوانییەی ئەوانت هەر لە پاریس هێنابایەتە بەرچاوی خۆت، هەر لە پاریس هەموو ئەو شتانەت لە تابلۆیەکدا بەرجەستە بکردایە و پێویستیت بەوە نەبوایە بچیتە لایان؟ بێگومان ناکرێ. هەر ئەمەشە وات لێ دەکا بچیتە سانتیاگۆ.

زۆرسەیرە! من باش دەمزانی و هەواڵم پێ گەیشتبوو: بەر لە شەش مانگ، دایک و باوک و دوو خوشکەکەم و برا بچکۆڵەکەم لە هەڵەبجە، بۆمبابارانە کیمیاوییەکە تەفروتوونای کردبوون؛ برا گەورەکەشم، خۆی و خێزان و منداڵەکانی، لە شاری سدنی لە ئوستراڵیا پەناهەندەبوون و تەنیا بە نامە هەواڵی یەکترمان دەزانی، هەروەها گوڵنۆشی خوشکەگەورەکەم، خۆی و مێرد و منداڵەکانی، تەنانەت هەر ناونیشانیشم نەدەزانین: پێنج ساڵ دەبوو پەڕاگەندەی پاکستان ببوون و لەوێ دەژیان... کەچی، سەیرە، لەگەڵ ئەوەش، نازانم بۆچی، ئەو دەمە، لای ئەو ئافرەتە، لەبەر چ هۆیەک بوو ئەو قسەیەم کرد؟ ئایا لەبەر ئەوە بوو کە «بۆخۆم» یان بۆ ئەو واپیشان بدەم و

بیسەلمێنم کە من ئەگەرچی سەرگەردان و بێ وڵات و ئاوارەشم، بەڵام لەگەڵ ئەمەش بێکەس و تەنیا نیم! ئایا بۆ ئەوە بوو کە دڵی خۆم بدەمەوە بەوەی گوایە هێشت چەند کەسێک، چەند ئینسانێک، چەند ئازیز و خۆشەویستێکم لە دنیادا هەر ماون کە بیرم لێ دەکەنەوە و بیریان لێ دەکەمەوە؟ لەبەر ئەوە بوو؟ نازانم! نازانم لەبەر چی بوو وام وت.

ئۆریانا پرسی: دایاننناوە بەیەکجاری لەوێ بژین؟

لەو دەمەدا فیگارییەکی کوشندە، وێڕای قوڵپی گریانێکی ئازاراوی، نەیاندەهێشت چیتر بتوانم تەماشای چاوی ئەو ئافرەتە بکەم، وتم: «بەڵێ».

ئۆریانا بە هیوای ئەوەی کە سبەینێ ڕۆمانەکەی خۆیم بداتێ بۆئەوەی وێنەی بەرگەکەی و هەندێ وێنەی دیکە بۆ ناوەوەی کتێبەکە بکەم، هەڵسا:

– باشە، دەی، کەواتە سبەینێ..

سبەی ئێوارە دەعوەتی کۆمەڵێک دەستە خوشک و هاوڕێیی خۆی کردبووم. گوتی:

– بێی دەیانبینی: هەتا بڵێی خۆشویستەنین. هانێ!

کارتێکی بچکۆڵەی پەمبەی دامێ؛ ناونیشانەکەی خۆی لەسەر نووسرابوو، وتی:

– کاتژمێر حەوتی ئێوارە.

کارتەکەم خستە باخەڵم:

– سوپاس.

کە هەڵسایینەوە، زەردەخەنەیەک دیسان ڕوخساری گەشاندەوە، وتی:

– چاوەڕێتین!

## 6

کە لە خاتوو ئۆریانا جیابوومەوە، دەم و دەست گەڕامەوە هوتێلەکەم. یەکسەر جەنتا و کەلوپەلەکانم کۆکردەوە و بەرەو وێستگەی شەمەندەفەر ڕۆیشتم: شەمەندەفەری دوانزە و نیوی شەوم گرت و بەرەو ئیسپانیا بەڕێ کەوتم.

بچوومایە چیم کردایە؟ بێگومان هیچ! وەک دەیان دەعوەت و شەوبێری و شەوئاهەنگی دیکە: لەسەرەتادا دەچووم لە ساڵۆنێک یان لە ژوورێکی ڕازاوەی پڕ لە کورسی و مێز، پڕ لە گڵۆپ و عەللاگە و فەخفووری و چەنگاڵ و کلینکس.. لەسەر قەنەفەیەک دادەنیشتم؛ چاوەڕێم دەکرد تا یەک یەک، دەستەدەستە برادەر و دەستە خوشکەکانی خاتوو ئۆریانا بێن و لەبەریان هەڵبستمەوە: خۆمان بە یەکتری بناسێنین؛ ئینجا پاشان وردە وردە بەدەم خواردنەوەی شەرابەوە دەکەوتینە قسە و گفتوگۆ و





پێکەنین؛ دوای ئەوەش ئیتر هەر بەدەم خواردنەوەی شەراب و ئەلکهوولی جۆراوجۆری دیکە، لەوانەشە بەدەم حەشیشە کێشانەوە، لەناو سوعبەت و پێکەنین و سەما و مۆسیقادا، وردە وردە ژوورەکە پڕ دەبوو لە دووکەڵ! هەموویشی لە پێناوی چی؟ لەپێناو بەسەربردنی شەوێکی ئاسوودەی فریودەرانەی ساتە وەخت، لەپێناو پێکەوەبوونێکی «خۆشی» ڕێبوارانە کە تەمەنی هەر ئەو شەوەیە و بەس، یا ئەوپەڕی شەوێکی تریش، هەفتەیەک، مانگێک و.. ئیتر تەواو!

سەیرە! من بۆچی ناتوانم باز بەسەر سروشتی خۆمدا بدەم؟ بۆچی ناتوانم منیش، ڕێبوارانە، تەنیا لەپێناو ساتەکاندا بژیم؟ ئەو دەستە چییە پێشم لێ دەگرێ و ناهێڵێ بتوانم منیش وەک هەموو ئەم خەڵکە، بەناو ئەو ژیانە ڕۆتینە ئاساییەدا ڕۆبچم؟ ئۆریانا ڕاستی دەکرد: من ناژیم. من نامەوێ یان حەزناکەم بژیم! ئەو ئاهەنگ و شەوبێرییە خۆشەی ئۆریانام بەجێ هێشت– کە دەعوەتیشی کردبووم؛ ملم نایە ئەو ڕێگا ئەفسووناوییەی کە نازانم جارێ تەنانەت بەرەو کوێشم دەبا!

لەناو فارگۆنی شەمەندەفەرەکە بەتەنیا دانیشتبووم و بیرم دەکردەوە. نەخێر، هیچ کەرێتی و شێتی نییە. هیچیش پێی ناگوترێ «دەمدەمی بوون» وەک ئەوەی هەموو جار نەریمان پێی دەگوتم. بڕیارێک بوو و دام. تەواو. من دەمەوێ بە لای کەمییەوە لەم جۆرە ژیانە ڕۆتینە درۆزنە کە ساڵانێکە لە پاریس پێی ڕاهاتووم، ڕزگارم ببێ. ئیتر ئەمە بۆچی دەمدەمی بوونە؟ تەخێر، بەپێچەوانەوە. بەڵام هەمیشە، ئەمەیە ئیتر؛ ئەگەر بتەوێ شتێ بکەی، پێویستە شتێکی دیکە فەرامۆش بکەی.

ئۆریانا! ڕاستە، گفتم دایێ گوتم «دێم»، بەڵام خۆ ئەم جۆرە قسانە، لەم جۆرە شوێنانە هەر دەکرێن. پاشان، ئەگەر بچوومایە، دەبوایە بەلای کەمییەوە دوو ڕۆژ، تۆ بڵێ سێ ڕۆژ خۆم دووا بخەم و هەر لە تووڵووز بمێنمەوە، تەنیا بۆ ئەوەی دوو هەزار فرەنکێکم دەست بکەوێ! نەء. پێی نەدەویست، ئێستا شەش هەزار فرەنکێکم پێیە، هەزار فرەنکی دوێنێ ئێوارەش... سەر و زیادیشە. نەخێر، هیچ عەیب نییە. پاشان... سەیرە! دەعوەتی ئەو ئافرەتە ڕۆماننووسە، ئێستا وام لێ دەکا دەعوەتەکەی فلیپم بیر بێتەوە، ئەو شەوەی بەبۆنەی جەژنی لەدایکبوونی سیمۆنی دەزگیرانی، دەعوەتی ماڵەکەی خۆیانی کردم؛ ئەو شەوەی بۆ یەکەمین جار چاوم بە «ڤینۆس» کەوت.

من دانی پێدا دەنێم: هەرگیز بە بینینی ئافرەتێک هێندە نەشڵەژاوم بەقەد ئەو شڵەژانەی کە لە دیمانەی ڤینۆسدا بەسەرم هات. ڤینۆس، ئەو شەوە، لە دەعوەتەکەی ماڵی فیلیپ، وەک دیمەنێکی خەوناویی کاتی حەشیشەکێشان بۆ من وەدیار کەوت. ڤینۆس دەمودەست هەستی پەرستنی لەلام دروست کرد؛ هەستم دەکرد حەزدەکەم بیپەرستم. تەنانەت کاتێ کەوتینە قسەش لەگەڵ یەکتر، بێزم لەو دەوروبەرەی خۆمان دەکردەوە کە قسەی تێدا دەکەین. وەک ئەو باڵندانەی کاتێ وەختی مردنیان نزیک دەبێتەوە حەزدەکەن بڕۆنە شوێنێک خۆیانی تێدا بشارنەوە، بەو شێوەیە منیش حەزم

دەکرد لەگەڵ ڤینۆس بچینە جێگایەکی لاتەریک، عەشقی خۆمانی تێدا بشارینەوە.

ڤینۆس! ئێستا لە سانتیاگۆ چاوەڕێمە. هەبێ و نەبێ ئاگادارە. ئێستا بێگومان نامەکەمی بەدەست گەیشتووە! چەند خۆش بوو: لە پاریس، لە قاوەخانەی «پاپییۆن» لە نزیک مەیدانی مادلێن، بەرامبەر یەکتر دانیشتبووین. بە دەم و دوویەکی چەند شیرینەوە، وەسفی ئەوەی بۆ دەکردم کە چۆن – وەختێ دەگەمە سانتیاگۆ – خانووەکەیان بدۆزمەوە! دەتگوت فریشتەیەکە و ئاوازی ڕەنگینی لە دەم دەبارێ. دەیگوت:

– کە دەگەیتە سانتیاگۆ و لە شەمەندەفەر دادەبەزی، وێستگەی شەمەندەفەری سانتیاگۆ وێستگەیەکی زۆر بچکۆلانەیە، تەنیا یەک دەرگای لێیە. لەو دەرگایەوە وردە وردە، کە دێیتە دەرەوە، یەکسەر دەکەویتە ناو دالانێک، کە سەر هەڵدەبڕی، دوو پێپلیکەی بەرزی بلۆک چن، لەملا و لاوە دەکەونە بەرامبەرت، ئیتر بە یەکێک لەو پێپلیکانەدا سەر بکەوە (بەسەر هەر یەکێکیاندا سەرکەویت، دەتهێننەوە سەر هەمان شەقام ) ئەو شەقامە، بە هەردوو لادا، چ بە دەستە ڕاست و چ بە دەستە چەپدا، هەر دەڕوا و درێژ دەبێتەوە. تۆ واز لەم دوو شەقامە درێژەی دەستە ڕاست و دەستە چەپ بێنە؛ تەماشای ڕووبەڕووی خۆت بکە: شەقامێکی باریک وبچکۆلانەی هەوراز لە بەرامبەرت هەیە. یەکسەر ئەو شەقامە باریک و هەورازەی بەرامبەری خۆت بگرە بەر و قەدبڕ سەرکەوە، هەر سەرکەوە، تا ئیتر شەقامە هەورازەکە دەبێتەوە ڕاستەڕێ؛ نزیکەی سەد مەترێکی دیکەش، هەر ڕاستە و ڕاست دەڕۆی، ئیدی لەو ناوە، بە دەستەڕاست، لووتکەی کەنیسەکی جوانت لێ وەدیار دەکەوێ: کەنیسەی سانت ژاک. بچۆرە کۆلانی کەنیسەکە (کەنیسەکە دەکەوێتە دەستە ڕاستت ) کاتێ دەگەیتە بەردەم کەنیسەی سانت ژاک، لە یەکەمین کۆلانی تەنیشت کەنیسەکەوە، بە دەستەڕاست، یەکسەر پێچ کەوە، ئیتر لەوناوە بپرسە «شەقامی پەرەدیس Paradis» ، هەر لەتەنیشت کەنیسەکەیە. شەقامێکی کورتی چەوڕێژە. دەستەڕاست و دەستەڕاست بڕوانە: خانووی ژمارە «٩» خانوویەکی بەرزی سپییە، دەرگایەکی سەوزی دوو دەربی هەیە، وێنەی تاووسێکی لەسەر کێشراوە.

لەناو فارگۆنی شەمەندەفەرەکە پەڕاوی یادگارەکانم دەرهێنابوو و پەڕەکانیم هەڵدەدایەوە. گەیشتمە سەر ئەو لاپەڕەی کە ناونیشانی ڤینۆسم لەسەر نووسیبوو. وەک ئەوەی سەیری تابلۆیەک، یان سەیری وێنەیەکی خەوناویی دڵگیر بکەم، قەیرێک ڕامام و بیرم کردەوە:

Venus Corbacho Esteban

Rue de Paradis 9

3- 1 , Santiago de Compostela

بەلام سەیرە؟ بۆچی ناونیشانی ڤینۆسم بەم خەتە ئالۆز و تێکەڵ و پێکەڵە نووسیوە؟ بە بیرم نایە بۆچی؟ من خۆ خەتم ئەوەندە ناخۆش نییە! بەلام خەتی خۆشمە، دەزانم.





بەبیرم دێ. لە قاوەخانەکەی نزیک مەیدانی مادلێن دانیشتبووین، هێور هێور ڤینۆس ناونیشانەکەی پێ دەگوتم، منیش بە دەست و خەتی خۆم دەمنووسییەوە.. بەلام زۆر سەیرە بۆچی بەم خەتە تێکەڵ و پێکەڵەم نووسیوە؟ نازانم! ئاخر، ئەو شەوەی پێکەوە بووین، هەر دەتگوت خەون دەبینم، کەمێک سەرخۆشیش بووم. زۆر سەیر بوو، هەموو شتەکان زۆر بەپەلە، زۆر سیحراوی گوزەریان کرد. بۆ سبەینێ، کە لە خەو بێدار بوومەوە، یەکسەر بەپەلە، پێش هەموو شتێک چووم تەماشای لاپەڕەکانی پەڕاوەکەمم کرد. کە ناونیشانەکەیم دۆزییەوە، بەشاگەشکەییەوە بەخۆمم وت «هەر باش بووە پێم کراوە ئەوەندەش بنووسم» .

ئەو بەیانییە لە ماڵی فیلیپ کە لە خەو هەڵسامەوە، باسی هیچ شتێکم لای ئەوان نەکرد. فیلیپ و دەزگیرانەکەی و هەندێ لە دۆستەکانیشی دەیانزانی.. ئێمەیان بینی کە هەڵساین و ماڵەکەی ئەوانمان بەجێ هێشت و پێکەوە چووینە دەرەوە، بەلام باسی ئەوەم نەکرد بۆ کوێ چووین و چیمان کرد و چیمان وت! هەروەها باسی ئەوەشم نەکرد کە ناونیشانەکەی ڤینۆسم وەرگرتووە و نیازم وایە بچم بۆ لای. نەء. تەنانەت ئەوان خۆشیان هیچیان نەپرسی. بەلام ڕاستە؛ جوان نەبوو ئێمە لە ناوەڕاستی شەوبێرییەکەدا ئەو هەموو دۆست و میوانەمان بەجێ هێشت و هەستاین چووینە دەرەوە. ڤینۆس گوتی:

– لە ئیسپانیا عادەت نییە ئاوها لە گەرمەی شەوبێرییەکدا میوانەکان بەجێ بێڵێت و بچیتە دەرەوە.

– لەناو کوردانیشدا بە هەمان شێوە.

– حەیامان چوو.

ڤینۆس پێدەکەنی. من گوتم:

– لەوە دەچێ فەرەنسییەکان لە هەموو کەسێک زیاتر تەقدیری «عەشق» بزانن!

– ئەوە ناخۆشە کە ئێمە هەردووکمان میوانی ئەوان بووین!

دڵیم دایەوە، گوتم:

– غەمت نەبێ؛ فیلیپ برادەرێکی زۆر نزیک و دڵسۆزی منە.

ئەو ئێوارەیەی فیلیپ و دەزگیرانەکەی دەعوەتیان کردبووم، کاتێ گەیشتمە ماڵەکەیان، حەوتی ئێوارە بوو. شووشەیەک هەنگوینم لەگەڵ خۆم بۆیان بردبوو. سیمۆنای دەزگیرانی فیلیپ، لەناو دالانەکەیاندا کاتێ شووشە هەنگوینەکەی بەدەستمەوە بینی، یەکسەر تریقایەوە، کردیە هەرا، بەدەم ماچ کردنی ئەملاوئەولامەوە هەر پێ دەکەنی. پاشان فیلیپ کە دەستی چەپی گرتبووم و لەبەر خۆیەوەش وەک ئەوەی بەدزییەوە شتێکم پێ بڵێ، پێی گوتم: «زۆر خۆشحاڵم کە هاتووی» . بردمییە ژوورەوە. فیلیپ ئەو ئێوارەیە دیار بوو هەر زوو کەمێک سەرخۆش ببوو. کە گەیشتینە ناو ساڵۆنەکە، یەکسەر دەنگەدەنگ و پێکەنینێکی کچانە کەوتە بەرگوێم، کە لە

ژوورەکەی تەنیشت سالۆنەکەوە دەهات. ناو سالۆنەکەش سێ کچ و چوار کوڕی گەنجی لێ بوو. دیار بوو هەموویان پاریسی بوون؛ سەرتاپا ڕێکپۆش، دەست بە پەرداخی شەرابەوە لە ناوەڕاستی سالۆنەکەدا ئەڵقەیەکیان دروست کردبوو. فیلیپ بەدەم زەردەخەنەیەکی دڵخۆش و نەشئاوییەوە ڕووی لە هاوڕێکانی خۆی کرد و دەستی بۆ من درێژ کرد، وتی:

– هاوڕێ هونەرمەندەکەی خۆمتان پێ دەناسێنم.. کوردەکە!

منی بە یەکە یەکەی هاوڕێکانی خۆی ناساند.

سەراسوێیی و هاوڕێیەتیم لەگەڵ فیلیپ و سیمۆنا زۆر خۆش بوو. دەتوانم بڵێم: دوو تاقە فەرەنسییەک بوون کە بەردەوام هاتوچۆی یەکترمان دەکرد. سەرەڕای ئەو پەیوەندییە بازرگانییەی لەنێوانماندا هەبوو، بەڵام ئەم بازرگانییە هەرگیز بەهیچ شێوەیەک، هیچ ڕۆژێک، لە هیچ کاتێکدا بەسەر ژیانی هاوڕێیەتیماندا ڕەنگی نەدەدایەوە: چۆن دەهاتن لەماڵەوە تابلۆیان لێ دەکڕیم، بە هەمان شێوەش تەلەفۆنیان بۆ دەکردم و گەلێک جاران پێکەوە دەچووینە پیاسە و شەوئاهەنگان. من بۆ خۆشم، زۆربەی ئێواران کە بێ ئیش دەبووم، دەچووم وەختم لە گەلەرییەکەی فیلیپ بەسەردەبرد کە کەوتبووە سەر شەقامە ڕەنگینەکەی ڕووباری سێن، ئەو شەقامە بەناوبانگەی کە زۆربەی گەلەرییەکانی پاریسی لە خۆ کۆکردبۆوە؛ فرسەتێک بوو بۆ خۆشم کە لەوێوە بچم سەردانی گەلەرییەکانی دیکەش بکەم و تازەترین تابلۆی نیگارکێشەکانی دنیا تەماشا بکەم. فیلیپ دەیگوت:

– هەرگیز قبووڵ ناکەم تۆ خۆت ئەزیەت بکێشیت و تابلۆکانت بهێنیت بۆ گەلەرییەکەم.

فیلیپ کە خاوەن گەلەرییەکی ناوداری پاریس بوو، پیکابێکی تایبەت بە گەلەرییەکەی خۆی هەبوو بۆ گواستنەوەی تابلۆ، دەیگوت:

– من شاگردی پسپۆڕم گرتووە کە لە کاتی گواستنەوەدا نەهێڵن هیچ ئینجێکی تابلۆ بڕووشێت یان بقنجێ.

بەبیرم دێ، ئەو پاش نیوەڕۆیەی بە سەردان هاتنە ماڵەکەم و دەیانویست بەبۆنەی جەژنی لەدایکبوونی سیمۆنا دەعوەتم بکەن، پێش ئەوەی ماڵەکەم بەجێ بهێڵن، فیلیپ دیسانەوە لە بەردەرگا دووپاتی کردەوە:

– دارا، تۆ تاقە کەسێکی کە لەڕیزی هاوڕێ نیگارکێشە کوردەکانم دەعوەتم کردووی، وەرە!

سیمۆناش، بە زەردەخەنەیەکی دڵنەوازانە، وتی:

– چاوەڕێتین.





دیار بوو، ئەو ماوەیە هەردووکیان هەواڵی بۆردومانی هەڵەبجەیان بیستبۆوە. دەنگوباسی منیشیان کەم تا زۆر لەڕێگای سیامەند و نەریمانەوە بیستبۆوە؛ دەیانزانی کە من تازە هەواڵی شەهیدبوونی دایک و باوک و زۆربەی خێزانەکەمانم پێ گەیشتبوو. لە هەمان کاتیشدا، هەر هەفتەیەک دەبوو لەگەڵ کاترینای دۆستم لەیەکتری جیا ببووینەوە. ئیتر ئەو ماوەیە، تووشی فیگاری و نائومێدی و پەژارەیەکی کوشندە هاتبووم. خۆم لە ماڵەوە نابوو، بەشێوەیەکی شێتانە کەوتبوومە سەر نیگارکێشان؛ شەو و ڕۆژ بەردەوام هەر خەریکی ڕەنگڕشتنی تابلۆ و دڕاندن و دەست پێکردنەوەیەکی تازە بووم.

ئەو پاش نیوەڕۆیە، فیلیپ، بێدەنگ، لە ناوەڕاستی ژوورەکەمدا ڕاوەستابوو، بەحەپەساوییەوە تەماشای تابلۆ دڕاوە پارچە پارچەکراوەکانی دەوری خۆی دەکرد. بەتووڕەییەکی هاوڕێیانەوە، دەنگی بەرزکردەوە:

– ئەگەر هەروا بڕوا، تۆ ئیتر بەدرێژایی ژیانت، هەرگیز ناتوانی تابلۆیەکی دیکە دروست بکەی!

سیمۆنای دەزگیرانی دانوشتایەوە، پارچە تابلۆ بۆیاغاوییە دڕاوەکانی هەڵدەگرتەوە، هەڵگێر و وەرگێری دەکردن؛ کونجکۆڵانە دەیویست بزانێ ئاخۆ چ شتێک لەناو ئەو تابلۆ دڕاوانەدا حەشاردراوە.. ویستوومە چی بڵێم و نەمتوانیوە؟

سیمۆنا لەناکاو هەستایەوە، دیار بوو دەیویست وام لێ بکات پەژارەی ئەو نسکۆ گەورەیەم بیربباتەوە و دڵم بداتەوە، وتی:

– دارا، دەتەوێ نیگاری چی بکێشی؟

منیش، جگەرە بەدەستەوە، مژی قووڵم لە جگەرەکەم دەدا، وەک شێت بەناو ژوورەکەمدا هەر دەهاتم و دەچووم؛ ڕاوەستام، گوتم:

– جوانی!

گوێم لێ بوو، سیمۆنا گوتی:

– جوانیی چی؟

«نازانم». «جوانیی ڕابردوو»، «جوانیی شارەکەم»، «جوانیی هەموو ئەوشتانەی لەدەستم چوون».

فیلیپ هات ڕا یگرتم. بە هەردوو دەستی، شانەکانی گرتم:

– گوێ بگرە، دارا!

من تەماشای پەڵە بۆیاغێکی سووری وشکەوەبووی نێوان قاچەکانی خۆم و ئەوم دەکرد.

– تۆ ئەم ماوەیە دیارە تەندروستیت تەواو نییە، پێویستە ماوەیەکی کەم دەست لە

نیگارکێشان هەڵگریت و کەمێک بێیتە دەرەوە و هەناسەیەکی تازە بدەی!

فیلیپ ڕاستی دەکرد. من ئەو ماوەیە، بۆ جگەرەکڕین نەبێ، بە هیچ شێوەیەک نەدەچوومە دەرەوە. تێکەڵ بە هیچ هاوڕێ و ئاشنایەکی تەنانەت کوردیش نەدەبووم. بەبیرم دێ خەلیل و بێجان هەر یەکە و دوو جاران، دوو دەمەوعەسران، جارێکیشیان نەریمان - بەیانییەک بوو، لە دەرگایان دا. لە پەنجەرەوە سەیری خوارەوەم کرد، کە دیتم ئەوانن، دەرگام لێیان نەکردەوە. باش بوو، بیریان بۆ ئەوە نەچووبوو کە لە ماڵەوەم و دەرگام لێیان نەکردۆتەوە. چووبوون لای فیلیپ گوتبوویان: «دارا ئەم ماوەیە بە حەشیشە کێشانەوە پیس گرتوویەتی»، «تا پاش عەسرانیش لە ماڵەوە هەر دەخەوێ».

نیوەشەوان، کاتێ هەموو هاوڕێکانم دەگەڕانەوە ماڵ و دەخەوتن، ئنجا من دەچوومە دەرەوە. دەچووم لە شەقامە ڕەنگاوڕەنگە ئاوەدانەکەی سانت لازاغ، دەست لەناو گیرفانی پاڵتۆ، بەتەنیا پیاسەم دەکرد. لەو ناوە، وەک ئەسپی قەرەج کە خاوەنی خۆی بزرکردبێ، بێ هیوا، بێ ئامانج، هەر دەگەڕام و دەسووڕامەوە. دەمویست ئەو هەوا پاک و سازگارەی نیوە شەو، لەو هێمنی و تاریکییە میهرەبانەی ئەو سەر شەقامەدا هەڵمژم و هیچ نەبێ ڕۆحم کەمێک ئەهوەن بکاتەوە.

کاتێ شەقامەکانیش، بەیەکجاری لە ڕێبواران چۆڵ دەبوون و قاوەخانەکان هەمووی تێکڕا دادەخران، دەچووم لە نزیک وێستگەی شەمەندەفەری سانت لازاغ لە قاوەخانەی ئەرژەنتینیەکان، بەتەنیا، تا دەمەدەمی ڕۆژبوونەوان بەدیار قاوەیەکی ساردەوە دادەنیشتم؛ سەرم لەناو هەردوو دەستم، بیرم دەکردەوە، بە خۆم دەگوت:

«ئەوەتا، ئەمڕۆ، بەتەواوەتی بێکەس و تەنیا ماویتەتەوە! دایکت، باوکت، خوشک و براکانت، هەروەها زۆربەی کەسوکار و ئاشناکانی شارەکەشت.. لەناوچوون. حەیف، هاوڕێکانی سەردەمی منداڵی و گەنجێتیشت، ئەمڕۆ، تەنیا بوونەتە تارمایی و یادگارێکی دوور، هەر یەکەیان پەڕاگەندەی وڵاتێک و کیشوەرێک بوونە و ئێستا ناونیشانی هیچیان نازانیت... وڵاتەکەشت بەتەواوی بۆتە گۆڕستانێک، ڕۆژ بە ڕۆژیش پتر وێران دەکرێ. هەموو شتێکت: منداڵیت، گەنجێتیت، شارەکەت، وڵاتەکەت.. لەناوچوون»؛ «تۆش لێرە لە ئەورووپا ئەوەتا... دوای ئەو هەموو ساڵ و ڕۆژگارە ئاوارانە، دوای ئەو هەموو ئەزموونە جۆراوجۆرانە؛ چیت؟ بەچی دەچیت؟ وەک تەنەکەیەکی پیسی پڕ زبڵت لێ هاتووە: ڕۆحت پڕ بووە لە گەندەڵی و پیسی، لە ئەزموونی ژەهراوی؛ چۆن دەتوانی پاکیی خۆت و ئەو ڕابردووە شیرینەی خۆت ڕزگار بکەی؟ چۆن دەتوانی جارێکی تر ئەو دنیا ڕەنگین و میهرەبانەی جارانت وەدەست بێنیتەوە! چۆن؟».

دووابەدووای بۆردومانەکەی هەڵەبجە، گوتیان:

- دارا، کوردەکانی پاریس دایانناوە بچنە بەردەم سەفارەتخانەی عیراق و





خۆپیشاندان سازبکەن.

گوتم: من نایەم.

گوتیان: دارا، هەندێ برادەر لە بەردەم بارەگای «نەتەوە یەکگرتووەکان» ڕەشماڵێکیان هەڵداوە و مانیان لە نانخواردن گرتووە.

گوتم: هیچیان بۆ ناکەن.

گوتیان: دارا، ڕێکخراوی خاچی سووری نێودەوڵەتیی فەرەنسی دەیەوێ سەفەرێک بۆ ئێران سازبکا...

گوتم: بۆ بازرگانی و گەشتوگوزارە.

گوتیان: دارا، سەرۆک حزبێکی کورد، لەسەر شاشەی تەلەڤزیۆنی TF1 پاساوی بۆ ئەم بۆردمانە کیمیاوییەی ڕژێمی عیراق هێناوەتەوە و گوتوویەتی «خۆ تەنیا عیراق چەکی کیمیاویی لەم جەنگەدا بەکارنەهێناوە!».

گوتم: دەستی خۆش بێ کە وای گوتووە.

گوتیان: دارا، ڕادیۆی «فرانس ئەنفۆ» دێتە ئەنستیتووی کوردی پاریس و دەیەوێ چاوپێکەوتن لەگەڵ کوردەکان سازبکا..

گوتم: بێهوودەیە...

من دڵنیا بووم و دەمزانی: تازە چیتر ناتوانم وڵاتەکەم ببینمەوە، وڵاتێک، کە هەم شارەکەم و هەم دایک و باوکم، هەم کەسوکار و هاوڕێ و ئاشناکانم بەیەکجاری بوونیان تێدا سڕابۆوە. سوودی چییە من دوای ئەوە، بێم لە ڕادیۆی «فرانس ئەنفۆ» جنێو بە ڕژێمی عیراق بدەم یان وابکەم کە خەڵکی فەڕەنسا بەزەییان بە کورددا بێتەوە؟ تازە سوودی چییە من بێم لە بەردەم بارەگا و سەفارەتخانە و ڕێکخراوەکاندا مان بگرم و خۆم پیشان بدەم و بلاڵێمەوە؟ وەک ئەوە وایە خۆم لە بەردەم خەڵک ڕووت بکەمەوە و پێیان بڵێم: وەرن خەڵکینە تەماشای ڕووتی و عەیبەکانم بکەن!

- مەگەر ئەم جەنگەی عیراق- ئێران خودی فەرەنسا و ئەمریکا و وڵاتە زلهێزەکانی دیکەی ئەورووپا سازیان نەکردووە؟

فیلیپ گوتی: با.

- چما هەر ئەوانیش ئەم هەموو هێزەیان نەداوەتە ڕژێمی عیراق بۆ ئەوەی ئێمەی بێ وڵات قڕ بکا؟

- با.

- ئەوەیە، ئیتر: ئەمریکا و ئەوڕووپا قەحپەن.. هەم سەریشمان دەبڕن و هەم بۆشمان دەگرین.

ئەو برادەرە فەرەنسییەی لەگەڵ فیلیپ بوو، نەمدەناسی، گوتی:

– ئەوڕووپا و ئەمریکا قەحپە نین؛ سەرکردەکەی خۆتانە کە واتان پێ دەکا.

منیش گوتم: «ئەم دکتاتۆرە سەرکردەی ئێمە نییە».

– با، چونکە خۆتان هەڵتانبژاردووە و دەتانەوێ.

– نەخێر، چونکە ئێوە پشتیتان گرتووە و کارتان پێیەتی.

هەر چۆنێک بێ، من دەمزانی کە ئیتر بێهوودەیە: هەموو ئەورووپا و ئەمریکا، تەنانەت هەموو دنیا لەپشت ڕژێمێکی دکتاتۆردا وەستاون کە دەیەوێ وڵاتەکەم سەرببڕێت و نەتەوەکەم لەناو ببا. ئێمەش، ئێمەی ئاوارەی ئێوارەکانی ئەورووپا، مردین هێندەی لە بەردەم بارەگا و سەفارەتخانە و ڕێکخراوەکاندا هاوار بکەین و مان بگرین و خۆمان پیشان بدەین. تا کەی؟ چیی تر بکەین؟ چیمان لەدەست دێ؟

– هەموومان درۆ لەگەڵ خۆمان دەکەین ئەگەر بڵێین جارێکی دیکە بەتەمای ئەوەین بگەڕێینەوە ئەو کاولبووەی خۆمان.

خەلیل لە هەندێ شت ڕاستی دەگوت. ئێمەی نەوەی ئاوارەی ئەورووپا، خەلیل گوتەنی «بووین بە کوردەکەی لە هەر دوو جەژنە بوو: نە دەتوانین بگەڕێینەوە، نە دەشتوانین لێرە بژین».

– من بام ئەگەر ڕۆژێک داهات توانیشم بگەڕێمەوە؛ ئایا ئەو مندااڵنەی خۆشم دەویستن هەمان ئەو مندااڵنەن کە جاران هەبوون؟ خەڵک، شەقام، درەختەکان... هەمان ئەوانەن کە من پێش دە پازدە ساڵ بینیبوومن؟

شەماڵی هاوڕێم ئەم ئازارە لە ویژدانیدا ئەزیەتی دەدا. جارێکیان لە بەرلینەوە شیعرێکی بۆم ناردبوو، نووسیبووی:

دارا گیان،

بۆ کوێ بڕۆینەوە؟

کە ئاسمانەکەی رووخابێت

کە ئیتر دیوارە خاپوورەکانی بۆنی پوونگە و میسکی لێوە هەڵنەستێ؟

بۆ کوێ بڕۆینەوە؟

کۆشکەکانی هەڵوەرین

چۆلەکەکانی زیڕینانە بە ئاسمانەوە چەسپین.

بۆ کوێ بڕۆینەوە؟

هەڵوەشانەوە، هەڵترازان، پووکان ئەندێشەکان،

دەست لە بنمیچی دووارۆژ دەدەم





چەندە تاڵن ڕۆژگارە نەزۆکەکان.

بۆ کوێ بڕۆینەوە؟

لێرە بۆ خۆم شانەشینێ دروست دەکەم

منارەکانی ڕەنگ بن،

وڵاتێ بێت بۆ زایەڵە.

کانییەکانی وەک لاوک شەوان

لە سەدیمدا جێگیر بن.

شانەشینێکی شیرین لێرە بۆ خۆم دروست دەکەم:

ماچ پێش ئەوەی لە دەم هەڵوەرێ دەبێتە پەپوولە،

شەهوەت پێش ئەوەی بزریکێنێ، نووراو دەخاتە جەستەی هیشکەوە

جەستە دادەگیرسێنێ

دەیکاتە چراخان.

من کە ئەم شیعرەی شەماڵم خوێندەوە، حەسوودیم پێی دەبرد: چونکە ژیانی خۆم لە پاریس، بەپێچەوانەی ئەو ئومێدە جوانەی شەماڵ، هەمیشە لێوانلێوی بێزاری و نائومێدی بوو. حەشیشە و خەونە ئەفیوونییەکان تاقە پەنا و داڵدەیەکم بوون لە پاریس، بەتایبەتیش کاتێ هەستم دەکرد کە نیگارکێشان و هونەرەکەشم هەر دادم نادەن. هەرگیز خەوم لێ نەدەکەوت. بە تەواوەتی وەکوو شێتم لێ هاتبوو. هەمیشە وەک بڵێیی بەدووای شتێکدا دەگەڕێم و خۆشم نەزانم ئەو شتە چییە! سەیرە، من ئەو ماوەیە بۆچی ئاوهام بەسەر هاتبوو! عەوداڵی چی بووم؟ بەدووای چیدا دەگەڕام؟

ئەو نیوە شەوەی کە لەگەڵ ڤینۆس پێکەوە بووین، پێم وت:

– ڤینۆس، ئەو وڵاتەی کە ساڵانێکی زۆر بوو لە دەستم چووبوو... دۆزیمەوە!

قاقا پێکەنی، وتی:

– وڵاتت دۆزییەوە؟

وتم: ئا.

– وڵاتی چی!

وتم: تۆ. تۆم دۆزییەوە.

ڤینۆس کەمێک داما، بە نەغمەیەکی غەمگینەوە وتی:

– ژیان تراژیدیایە، دارا گیان.. منیش لە کۆتاییدا هەر لەناو دەچم.

وتم: ڕەسمت دەکەم.

وتی: ئنجا ڕەسم دەتوانێ چی بکا!

– ڕەسمی جوانیت، میهرەبانیت، هەموو شتێکی کە پەیوەندیی بە خۆشەویستی و جوانیی تۆوە هەیە.

ڤینۆس پێکەنی. پێم وت:

– جوانیی تۆ بلیمەتیی منە: بیرەوەری و رابردووەکانم زندوو دەکەنەوە.

سەری دانەواند. بیری دەکردەوە. بە غەمگینیەکی قووڵەوە حەسرەتێکی هەڵکێشا.

وتم: چیتە؟

وتی: هیچ.

– چیتە، بیڵێ!

– دایک و باوکم.

– ئێ؟

– بلیتیان بڕیوە.

– بلیتی گەڕانەوە بۆ سانتیاگۆ؟

– ناچارین.. دەبێ سبەینێ بگەڕێینەوە.

بە پەنجە چەناگەیەم بەرز کردەوە و سەیری چاوەکانیم کرد. گوتی:

– حەز ناکەم بڕۆم و بەجێت بهێڵم!

– پێم وتی (دێم )، دێمە لات!

– دێی بۆ ئیسپانیا؟

– ئا.

– دێی بۆ سانتیاگۆ؟

– هەر بەیەکجاری دێم.

– بۆ لای من؟

– دێم لەوێ دەژیم.. لەگەڵ تۆ.

بە نیگایەکی پڕ لە شاگەشکەیی و حەپەسانەوە سەیری دەکردم، وتی:

– باوەڕناکەم!

– دڵنیابە. دێم!

بە دڵنیاییەوە سەری بەرز کردەوە. شەپۆلی قژی، وەک تاڤگەیەکی ڕەشی چۆلەکاوی بەپشتا خست و بەدەم تریقانەوەیەکی پڕ لە خۆشبەختیەوە پێم پێکەنی:





– تۆ شێتی.

ئنجا یەکسەر بازووەکانی، هێندەی میهرەبانی و ئەوین حەز بکا، بۆم کردەوە و بەتاو باوەشی پێدا کردم. منیش بازووەکانم توند بە تینوویێتییەوە لەناو قەدی ئالآند، سەرم خستە سەر گەرمایی و میهرەبانێتی مەمکەکانی. کاتێ گەردەنیم ماچم کرد، حەزم دەکرد بگریم.

## 7

ئای لەو شەوە خۆش و زێڕەوشانە! سەیرە! نەشئەی ئەو چەند ساتە کەمەی لەگەڵ ڤینۆس پێکەوەبووین، هێندە شیرین و خەوناوی بوون، هێندە بەپەلە و بەلەز تێپەڕین، کە تەناتەت جاربەجار دەکەومە گومانەوە؛ وام لێ دەکا بە خۆم بڵێم: «لەوانەیە بەشێکی زۆری ئەو شتانەی دیمن، ئەوانەی بیستمن، ئەوانەی تامم کردن، تەنیا زادەی خەیاڵ و وەهمێکی پووچی خۆم بن و بەس!». خۆ هەموویشی، دوو هەفتەی بەسەردا تێ نەپەڕیوە. ڕووداوەکان، وەک ئەوەی دوێنی ڕوویان دابێ، لەپێش چاومن:

من ئەو ئێوارەیەی دەعوەتەکەی ماڵی فیلیپ، بەبیرم دێ، سەبارەت بەوەی ماوەیەکی زۆربوو لە ماڵ نەهاتبوومە دەرەوە و تێکەڵ بە خەڵک نەببووم، بەتایبەتیش لەم جۆرە دانیشتن و ئاهەنگانە دانەنشتبووم، لەناو سالۆنەکەدا، هەستم بە جۆرە نامۆیی و دڵگوشرانێک دەکرد. لەسەرەتادا، لەوە دەچوو کە سیمۆنای دەزگیرانی فیلیپ، هەر زوو هەستی بەو حاڵەتەی من کردبێ؛ لەناکاو، لەپشتەوەڕا، دەستەڕاستی خستە سەر شانم. کە ئاوڕم دایەوە، زەردەخەنەیەکی دڵدەرەوەی خوشکانەی بۆ کردم (بە دەستی چەپی پەرداخێک شەرابی بۆ ڕاگرتبووم ) منیش کە پەرداخی شەڕابەکەم لێ وەرگرت، هەستم کرد دەیەوێ شتێک بچرپێنێتەوە گوێچکەم، وتی:

– هیوادارم کە دەعوەتەکەت بە دڵ بێ، دارا!

منیش، پێکەنیم، وتم:

– ئاخیرەکەی، هەر هێنامتانە دەرەوە!

لەو سەرو بەندەدا، دیتم: کچێک، کە سیمۆنا پێشتر پێی وتبووم خەڵکی مۆناکۆیە، لەتەنیشتمەوە، جگەرەیەکی حەشیشەی پێشکەش کردم، منیش لێم وەرگرت، وتم:

– سوپاس.

کچەکە ڕۆیی، سیمۆنا پێکەنی. پاشان دیتم کچێکی تر، لە ناوک بەرەو سەرەوەی ڕووت: سوخمەیەکی تەنک و تۆڕچنی ڕەشی لەبەر بوو «پوولەکەی وردیلانەی سەوز و سوور بەسەر سنگیەوە دەتروسکانەوە» لە ژوورەکەی تەنیشت سالۆنەکەوە، بە شەتاو هاتە دەرەوە و ئێستێکی کرد. قەڵماسنگی نیگای یەکسەر کەوتە سەر من،

زەردەخەنەیەکی کرد و وەک چاوەڕوانی شتێ بکا، ڕووی کردە سیمۆنا، سیمۆناش ڕووی لە من کرد و دەستی بۆ لای کچە درێژ کرد:

– «ئان»، خەڵکی ئیسپانیایە!

دەستی تەوقەم بۆی درێژ کرد و بە سەر هێمای حورمەتگرتنم نیشاندا.

– پێخۆشحاڵم.

سیمۆنا درێژەی پێ دا:

– سێ ساڵ پێش ئێستا، لەگەڵ «ئان» لە زانکۆی بەرشەلۆنە پێکەوە قوتابی بووین.

منیش بە زەردەخەنەیەکەوە، بۆ ئەوەی بایەخ و مانایەک بدەمە ئەو قسانەی سیمۆنا، ڕووم کردە «ئان»:

– ئێستا لە پاریس دەژیت؟

– نەخێر، تاکو ئێستاش هەر لە بەرشەلۆنە.

ئەمەی وت و سەیرێکی سیمۆنای کرد، ئینجا بە زەردەخەنەیەکی کەیفخۆشانە و غەمزاوییەوە وتی:

– بەڵام دامناوە بێمە پاریس و لەمەودووا بەیەکجاری لێرە بژیم.

ئاگام لێ بوو لەو دەمەدا سیمۆنا، زۆر سرک، کشایەوە و بەجێمانی هێشت.

لەگەڵ «ئان» بێ ئەوەی هیچ قسەیە بکەین، ڕاوەستابووین. ئان سەری خۆی داگرتبوو، بێدەنگ، تەماشای بەرپێی خۆی دەکرد و لەسەر قومپانیی قاچی ڕاستی، پێی خۆی بەم لاو بەولادا دەسووڕاند. منیش تازە چەند مژێکم لە جگەرەی حەشیشەکەم دابوو.. چاوم بە پەنجەرەی ژوورەکە کەوت: کرابۆوە، هەر دەتگوت تابلۆیەکی زێڕەوشانی درەوشاوەیە؛ تاریکایی شەوی گرتبووە خۆی و چەند ئەستێرەیەک لەناو تاریکییەکەدا، لە دوورەوە دەتروسکانەوە. لە سووچێکی لاتەریکیشەوە، ئەستێرەیەکی لە هەموویان وردتر بە تەنیا دەبریسکایەوە.

ئەو پەنجەرەیە بەشێوەیەکی سیحراوی سەرنجی ڕاکێشام. دەتگوت یەکەمجارە لە ژیانمدا پەنجەرە دەبینم. بە پەرۆشییەوە مژێکی دیکەم لە جگەرەی حەشیشەکەم دا و چاوم دروویە ئەو جوانییە. یەکسەر بەرەو پەنجەرەکە چووم. کە ڕاوەستام، کەوتمە سەیرکردنی ئەستێرە لاتەریکە خنجیلانەکە، کە لە دوورەوە دەدرەوشایەوە. هەستم دەکرد ئەو ئەستێرەیە جریوە و ئاوازێکی هەتا بڵێی غەمگین و لە هەمان کاتدا دڵگیری لێوە دێ. ئاواز و دەنگی، ئەگەرچی لەوانەیە تەنیا وەهمێکی ئەفیوونیی پووچی خۆم بووبێ، بەڵام بەبیرم دێ، لە ئاوازێکی ڕاستەقینە زۆر بەهێزتر دەکەوتە بەر گوێچکەم و دڵی دەخستمە خۆشی و سەماوە.

نازانم داخوا چەند دەقیقە، چەند سەعات تێپەڕبوون و منیش هەر ڕاوەستا بووم و





تەماشای ئەو ئەستێرە دوورەدەستە خنجیلەیەم دەکرد. لەناکاو بە خۆمم وت: «با هەست بەوە نەکەن کە سەرخۆش بوومە» ڕووم وەرگێڕایەوە ناو سالۆنەکە. دیتم: سالۆنەکە تەواو گۆڕابوو، جگە لەوەش زۆر ئەهوەن و خامۆش ببۆوە. لە دەستەچەپدا فیلیپ لەگەڵ کچ و کوڕێک دانیشتبوون، سەرگەرمی قسە بوون. بەتەنیشت ئەوانیشەوە، دوو کچ، وابزانم یەکێکیان ناوی (کلێر) بوو، ئەوی تریشیان ئەو کچە بوو کە حەشیشەکەی دابوومێ، لە تەنیشت یەکتر، ڕاوەستابوون، ئانشکیان بەسەر پیانۆی ناو سالۆنەکە دادابوو، جگەرەی حەشیشەیان دەکێشا و نەرم نەرم بەدەم قسەکردنەوە پێدەکەنین. لەناو ڕێڕەوەکەشدا «ئان» کەمێک مەلوول ڕاوەستابوو، نازانم چاوەڕێی چیی دەکرد. بە دەستە ڕاستەوەش: دوو پیاو «یەکێکیان قاتێکی سپی لەبەر بوو» لە نزیک من، لەسەر کورسی دانیشتبوون شەترەنجیان دەکرد.

من هەستم بە کەمێک هیلاکی دەکرد. پێڵووی چاوەکانم بەزەحمەتییەوە بەرز کردەوە، تەماشای ژوورەکەی دەستەڕاستی خۆمم کرد، دیتم: کچێک، کە دەتگوت فریشتەیەکی ناو خەونە ئەفیوونییەکانە، بەتەنیا، لەسەر کورسییەک دانیشتووە و تەماشام دەکا؛ وەک ئەوەی برایەکی چەند ساڵ ونبووی سەرگەردانی خۆی بینیبێتەوە، بە نیگایەکی گەشی پڕ لە پەرۆشی و خۆشەویستییەوە، گەرم، لێم دەڕوانێ. کاتێ منی بینی سەیری دەکەم، کەمێک شڵەژا، یەکسەر چاوی داگرت.

لەو ساتەدا بوو، لەو شەوەدا بوو کە من یەکەم جار ڤینۆسم ناسی.

من هەر لە یەکەم چاوپێکەوتنەوە، یەکسەر هەستم کرد شتێک لە قووڵایی ڕۆحمەوە لەرزی. وام بە خەیاڵدا دەهات کە من ئەم ئادگارە شیرین و پڕ لە میهرەبانییەی ئەوم، ئەم دووچاوە گەش و ئاشنا و پڕ پەرۆشییەم، چەندین ساڵ پێش ئێستا، لە شوێنێکی دیکەدا، یا لەوانەیە لە سەردەمی منداڵیمدا، یانیش هیچ دوور نییە لە خەونێکمدا دیبێ!

مات، بێدەنگ، بەڵام لەناوەوە شڵەژاو، تەماشای بەرپێی خۆم کرد و بیرم کردەوە. جورئەتی ئەوەم نەدەکرد جارێکی تر بتوانم سەرم هەڵبڕمەوە و تەماشای ڕۆحی سەرگەردانی خۆم بکەمەوە کە لەودیو چاوەکانی ئەودا دەدرەوشایەوە. هێندەی دەمکرد و دەمکرد نەمدەتوانی باوەڕ بەوە بهێنم کە «جوانییەکی ئەوتۆ»، «میهرەبانی و سۆزێکی ئەوتۆ» کە من تەنیا لە خەوندا یان لە ساتە وەهمیە ئەفیوناویەکاندا دەمدیت، ئەمڕۆ ئەوەتا لە بەردەمم ڕاوەستاوە و بانگم دەکا.

لەناو ئەو شەیدابوون و ئەوینە لەناکاوە، کە یەکسەڵەف سەرتاپای ڕۆحمی هێنابووە لەرزین، هەستم بە سوگواری و دڵتەنگیەک دەکرد. هەر بەپێوە، دەم و چاوم لەنێو دەستەکانی خۆمدا شاردەوە؛ حەزم دەکرد بگریم.

بەپێوە وەستابووم و دەم و چاوم لەنێو دەستەکانی خۆمدا... نازانم داخوا چەند

دەقیقە و سات، بە هەمان شێوە، بێ ئەوەی هیچ جووڵەیەک بکەم، مامەوە.

لەناکاو، دەستێک بە نەرمییەوە کەوتە سەرشانم. ڕاچڵەکام. سەرم بەرز کردەوە، دیتم: «ڤینۆس» بوو. جووتێ گوارەی درێژی شەش پاڵوویی وردیلانە بە گوێچکەیەوە دەترووسکانەوە. سەری بە لاواندنەوەیەکی پڕ لە سۆزەوە بە لای ڕاستا لار کردەوە:

– بۆچی دەگری!؟

ئاوازی نیانی دەنگی، یەکسەر ڕۆحمی بێدار کردەوە. بە ئاسوودەیی و پاکیی چاوەکانی خنامەوە، بەڵام لەناو شەپۆلی سۆز و خۆشەویستی خۆمدا نەمدەتوانی هیچ وەڵامێکی بدەمەوە. لەوە دەترسام هەر قسەیەک بکەم، ئەو بە هەناسەم وەک پەڵە هەورێک یا وەک دووکەڵێکی تەنک لەبەر چاوم ون ببێت و نەیبینمەوە. لە ئاکامدا، لەسەرەخۆ، بە زەردەخەنەیەکی شاگەشکەییەوە، وەک ئەوەی لەگەڵ پەپوولەیەک بدوێم، پرسیم:

– تۆ خەڵکی کوێی؟

وتی: سانتیاگۆ.

وتم: ئامریکا؟

وتی: نەء، سانتیاگۆ دی کۆمپۆستێللا، لە ئیسپانیا.

خۆم لەبەر ترووسکەی چاوەکانی پێ ڕانەدەگیرا؛ هەستم دەکرد ئەو جوانییە ئاسمانییە، ئەو میهرەبانییە بێ سنوورە، ئەگەرچی ئەوەتا ڕووبەڕوومە، بەڵام لەگەڵ ئەوەش لە منەوە یەکجار دوورە. حەزم دەکرد بە هەرچی جۆرە قسەیەک بێ، بیدوێنم، هەست بە بوونی ڕاستەقینەی بکەم، وتم:

– ئەی سیمۆنا چۆن دەناسی؟

وتی: سیمۆنام لێرە ناسی.

– لێرە!

– بەڵێ، ئەمشەو.

ئنجا پەنجەی بۆ لای مووبەقەکە درێژ کرد:

– ئان دەعوەتی ئێرەی کردووم.

– کەواتە بە سەفەر هاتوویتە پاریس!

وتی: بەڵێ، لەگەڵ دایک و باوکم.

تەماشای ئەو گوڵە مۆرەیم دەکرد کە بە شریتێکی تەنک لە تەوقی پرچی خۆی بەستبوو. گوتم:

–لەوانەیە خزمێک یا کەسێکتان لە پاریس هەبێ؟

–نەخێر. من تەنیا ئان دەناسم. ئان خەڵکی گوندەکەمان بوو، لە منداڵییەوە لە





قوتابخانە پێکەوە بووین. پاشان ئەو بۆ خوێندن چووە بەرشەلۆنە و سانتیاگۆی بەجێ هێشت. ئیدی لەیەکتری دابڕاین.

دەست بە پەرداخی شەڕابەوە، ئاماژەم بۆ مووبەقەکە کرد:

– ماوەیەک پێشتر قسەمان دەکرد، وابزانم دەیگوت کە دەیەوێ لەمەودووا لێرە لە پاریس بژی!

–بەڵێ. ئەو دەیەوێ نەگەڕێتەوە سانتیاگۆ، دەیەوێ لەمەودووا بێتە پاریس کاربکات و هەر لێرەش ژیانی خۆی پێکەوە بنێ.

من لەو دەمەدا تەماشای تاڵە قەیتانێکی باریکی سووری پێڵاوە پەمبەکەیم کرد، ئەو تاڵە قەیتانە باریکە سوورەی کە بەقەد حەڤدە ژنی جوان؛ جوان دەهاتە پێش چاوم. لەناکاو لێمی پرسی:

–تۆ قوتابییت؟

ڕاچڵەکام، وتم:

– نەخێر.

– ئەی؟

– کاردەکەم.

وتی: کاری چی؟

وتم: من نیگار کێشم. بە نیگارکێشان دەژیم.

دەم و دەست خنایەوە، بەخۆشییەوە لەسەر پەنجەکانی پێی، لەنجەیەکی پەپوولەیی کرد، خەریک بوو لە خۆشیان باڵ بگرێ، وتی:

– ئاه! تۆ نیگار کێشەکەی!؟

من بە سەرسامی و شاگەشکەییەوە، لار ببوومەوە و تەماشای پرچیم دەکرد کە دەتگوت تاڤگەیەکی ڕەشی چۆلەکاوییە و دادەڕژێ، تەماشای گەندەمووە جوانەکانی پەنا گوێچکەی چەپیم دەکرد. بە دڵخۆشییەوە بە خۆمم دەگوت:

– داخوا کەی بتوانم پۆرترێتێکی ئەو جوانییە خەونی و پاکە، ئەو میهرەبانییە ئاسمانییە بکێشم!

لەناکاو دیمەنێک کەوتەوە بیرم. لێم پرسی:

– سەیرە! من و تۆ ڕۆژێک لەسەر سنووری ئیسپانیا و ئیتاڵیا یەکترمان نەدیوە!؟

پێکەنی، وتی:

– هەموو پیاوێک وەختێ دەیەوێ موجامەلەی کچێک بکات، پێی دەڵێ «ئەرێ من و تۆ پێشتر لە شوێنێک یەکترمان نەدیوە!؟».

– با. تۆ، لەگەڵ ژنێکی بەتەمەن بووی. واپێدەچوو دایکت بێ.

ڤینۆس دیسان پێکەنی، دەمی نازی هەڵێنایەوە:

– من پێش ئەوەی بتبینم، سیمۆنا و فیلیپ باسی تۆیان دەکرد، من نەمدەزانی ئەو نیگارکێشە تۆی!

لەوکاتەدا ئاگام بەتەواوەتی لە دەوروبەری خۆم برابوو، سەیری قوولایی چاوە سۆزاوییەکانیم دەکرد، بەشێوەیەک کە لەو ساتەدا هەستم دەکرد ڕۆحم، هەموو بوونم، بەشێکە لە ڕەنگ و شەپۆلی چاوەکانی.

– تۆ خەڵکی کوێی؟

بەم پرسیارە، سۆز و غەریبییەکی قووڵ لە ناخمدا قوڵپیان سەند، گوتم:

– خەڵکی چاوەکانتم.

پێکەنی، وتی:

– نازانم.

قوڵپی گریانێکی بەختەوەری لە قورگمدا گیری خواردبوو، پێم وت:

– من هەست دەکەم کە ماوەیەکی زۆرە، ماوەیەکی یەکجار زۆرە تۆ دەناسم!

لەو کاتەدا هەستم کرد شتێک لە قوولایی ڕۆحیدا لەرزی. چاوەکانی بە شەرم و نەزاکەتەوە داگرت. بێ ئەوەی سەری خۆی هەڵبڕێ، پەنجەکانی هەڵدەگلۆفین؛ وەک منداڵێک لەنێوان هەستی دامان و بەختەوەریدا دەخنایەوە. من تەماشای هەڵگلۆفینی پەنجەکانیم دەکرد، پێم وت:

– پاریست پێ خۆشە؟

یەکسەر بە هەڵچوونێکی منداڵانەی پاکەوە، بە نەغمەیەکی نارەزاییی، وتی:

– زۆر نەگەڕاوین، تەنیا پێنج ڕۆژە لە پاریسین، ئەویش هەر لەگەڵ دایک و باوکم بووم.

– سەرتان لە مۆزەخانەی «لووڤغ» نەدا؟

– تەنیا بەشێکمان دیت، من حەزم دەکرد ساڵۆنی تابلۆکان ببینم، کەچی ئەوان بردمیانە ساڵۆنی شتە کۆن و ئەنتیکەکان.

– لە هوتێل دابەزیون؟

– بەڵێ.

– لە کوێ؟

– لە مەیدانی مادلێن. پێ دەزانی؟

– بەڵێ.

– شوێنێکی خۆشە.

– وەختی خۆی ماڵم لەوێ بوو، ژوورێکم لەوێ بە کرێ گرتبوو.





– چەند ساڵە لە پاریس دەژیت؟

وتم: حەوت ساڵە.

– ئەی پێشتر لەکوێ دەژیای؟

وتم: لە نەرویج. لە ئۆسلۆ پەناهەندە بووم.

– چەندە ساڵ لەوێ مایتەوە؟

– تەنیا ساڵێک.

– لەوێ چیت دەکرد؟

– دەگەڕام.

بە پێکەنینێکی نەرمەوە وتی:

– لە چی دەگەڕای؟

وتم: لە تۆ.

پێکەنی، وتی:

– لە من دەگەڕای!

– ئا، لە تۆ دەگەڕام.

ئەم جارە بە دەنگی بەرز دایە قاقای پێکەنین، پێکەنینێکی شیرینی ئەوتۆ کە نەغمەی، وەک شنەبایەکی بۆنخۆش، ڕۆحمی خستە خرۆشانەوە.

لەناکاو کە سەرم هەڵبڕی: لەناو ساڵۆنەکەدا پیاوێکی کۆک و ڕێکپۆش، ئەوەی کە قاتە سپییەکەی لەبەر بوو، سەروقژ زەرد، شانە لێدراو، بەرامبەر کورێکی گەنج، لەسەر مێزی شەترەنج دانیشتبوو، تەماشای ئێمەی دەکرد. کە سەیریم کرد، یەکسەر ڕووی بەرەو لای مێزی شەترەنجەکەی خۆی وەرگێڕایەوە، لە هەمان کاتدا سیمۆنا لە داڵانی مووبەقەکەوە دوو فەخفووری زەڵاتەی پێ بوو کە بریتی بوون لە تەماتەی قاش کراو لەگەڵ چەند پارچە پەنیرێک، هاتە ژوورەوە. دوو فەخفوورییەکەی دایە دەست من و ڤینۆس. بەدەم زەردەخەنەوە، وتی:

– فەرموون!

هەردووکمان، بەدڵخۆشی و بەدەم زەردەخەنەوە، دوو فەخفوورییە زەڵاتەکەمان لێ وەرگرت:

– سوپاس.

ڤینۆس فەخفوورییەکەی بە دەستی چەپییەوە گرتبوو، بێ ئەوەی تەماشای سەرمەستی و نەشئەی بەختەوەرانەی سەر ڕوخسارم بکا قژی بە دوواوەدا خست و درێژەی بە قسەکانی دا:

– بەڕاستی، زۆر خۆشحاڵم کە ئەمشەو تۆم لێرە ناسی!

سیمۆنا دوو فەخفووریی دیکەی بەدەستەوە، پێشکەشی پیاوە ڕێکپۆش و گەنجەکە کرد، کە هەردووکیان سەرقاڵی شەترەنج بوون. گەنجەکە وەری گرت، بەڵام پیاوە قات سپییە یەخە بە مەدالیاکە وەری نەگرت، وتی: «سوپاس». ئینجا سەیرێکی ئێمەی کرد و سەری بەرز کردەوە تەماشای ناو فەخفوورییەکەی دەستی سیمۆنای کرد:

– ئەوە چییە؟

پاشان بە دەنگی بەرز پێکەنی، دەیویست تانە لە ئێمە بدا:

– ئەوە تەماتەیە کە خەڵک ئاوها ڕۆمانتیک دەکا؟

ڕووی کردە گەنجەکەی بەرامبەری، بە دەنگێکی بەرز لێی پرسی:

– تۆش وای، پاتریک؟

– چی؟

– تۆش کە تەماتە دەخۆی، وات لێ دێ عاشق ببی؟

گەنجەکە ڕووی لە شەترەنجەکە بوو وتی:

– بە حەشیشە، بەڵێ؛ بەڵام بە «تەماتە» نەخێر.

ئینجا هەر دووکیان یەکسەر دایانە قاقای پێکەنین. لە دڵی خۆمدا گوتم:

– ئینسان چەند نیهادپیس و شەڕەنگێزە!

یەکسەر تێگەیشتم کە ئەو پیاوە قات سپییە ماوەیەکی زۆر بووە لە پشت ئێمەوە گوێی لە قسەکانی من و ڤینۆس ڕاگرتبوو. بە نیگایەکی بریندار و پەرێشانەوە لەگەڵ ڤینۆس تەماشای یەکترمان دەکرد. ڤینۆس، چاوەکانی هێندە گەش و پاک و ڕوون بوون کە نەیاندەتوانی هەستی سەغڵەتبوون و دڵڕەنجانی ئەوساتەیان تێدا بشاردرێتەوە:

– بەیارمەتیی خۆت، دەچمە لای ئان!

ڤینۆس ئەمەی وت و بەرەو داڵانی مووبەقەکە ڕۆیشت. منیش ئاوڕێکی دوواوەم دایەوە، کورسییەکی چۆڵم بینی: بە قەدیفەیەکی مۆر ناوپۆش کرا بوو. لەولا تریشەوە تۆمارێکی گەورەی دیسکی گۆرانیم بینی کە کۆمەڵێک دیسکی جۆراوجۆری ڕەنگینی لەسەر پەخش کرابوو. من بێ ئەوەی بتوانم لە ناوی گۆرانیبێژەکانی سەر دیسکەکان ورد ببمەوە و بیانخوێنمەوە، ڕووم وەرگێڕایەوە. قەڵماسنگی نیگام کەوتە سەر وێنەیەک کە لە شێوەی کاریکاتۆر بە قەڵەمی ڕەش دروستکرابوو و بە دیواری دەستە ڕاستمەوە لە چوارچێوەیەکی زیوین گیرابوو.

– وابزانم ژن و مێردایەتیش هەر شتێکی بێهوودەیە، فیلیپ. ناتگەیەنێتە هیچ!

ئەم قسەیە، لەناکاو، لە تەنیشتمەوە هات. بە دەنگێکی نزم وترا، بەڵام زۆر بەهێز





لە مێشکی مندا زرنگایەوە. ئەو پیاوەی ئەم قسەیەی کرد لەتەنیشت فیلیپ دانیشتبوو، ملی شۆڕ کردبۆوە، سەرخۆش و ماندوو، درێژەی پێدا:

– دەتگەیەنێتە ماڵێکی سارد، ماڵێکی ڕۆتین و بێزار.

ئنجا سەرخۆشانە، پێکەنی:

–وەکو ئەورووپا!

فیلیپ، بەزەحمەتی و بەڕەتاوییەوە هەڵسایەوە، بەرەو لای من هات، زەردەخەنەیەکی ماندووی بۆ کردم:

– چۆنی، دارا؟

ئنجا، دوو پەنجە ماندووەکانی، کە نیوە جگەرەیەکی حەشیشەی پێوە گرتبوو، بۆ لای من درێژی کرد.

– سوپاس.

زۆر بە هێواشییەوە «چونکە لەوە دەترسام تووتنەکەی بکەوێ» جگەرەکەم لێ وەرگرت. یەکسەر چەند مژێکی قووڵم لێدا. لەناکاو، ئەو کوڕە گەنجەی کە شەترەنجی لەگەڵ پیاوە قات سپییەکە دەکرد، ڕووی لە کچێک کرد «کە لە دەستەچەپی منەوە لەسەر کورسییەکی درێژ لەگەڵ کوڕێک دانیشتبوون و یەکتریان ماچ دەکرد»، هاواری کرد:

–دۆڕاندم، شانتال!

پیاوە قات سپییەکەی بەرامبەری، خەریک بوو جگەرەیەکی درێژی چرووتی دادەگیرساند، لەسەرەخۆ، وتی:

–هەڵبەتا دەدۆڕێنی!

کوڕە گەنجە «دۆڕاوەکە» هەڵسایەوە، بەرەو لای ئەو کچەی ناوی «شانتال»بوو ڕۆیشت، کە لەوە دەچوو دەزگیرانی یا خێزانی بێ. بە هیلاکی و پەرێشانییەوە لێی پرسی:

–بڕۆین، شانتال؟

پاشان یەکسەر بێ ئەوەی چاوەڕوانی وەڵامدانەوەی «شانتال» بکا، ڕووی وەرگێڕا و بەرەو لای عەللاگە درێژەکەی تەنیشت پیانۆکە چوو. وتی:

– پیاو بچێ بۆخۆی بەتەنیا لە ژوورێک دابنیشێت و شیعر بنووسێ، باشترە لەوەی بێ لێرە واتێ بگا کە عاشق بووە و حەشیشە کێشان و شەترەنج ئاسوودەی دەکا!

من کە گوێم لە قسەی ئەو کوڕە گەنجە بوو، لەسەرەتادا، لە دڵی خۆمدا وتم: «ئەو کوڕە، شاعیرە!»، پاشان بیرم کردەوە، وتم: «نەء. لەگەڵ منیەتی!». سەرم بەرز کردەوە

و ڕووم کردە ئەو کوڕە گەنجە، بە نەوایەکی غەمگین و هیلاکەوە، بەڵام پڕ لە دڵ بڵندییەوە، وتم:

– بەڵام هەرچۆنێ بێ، هاوڕێم؛ حەشیشەکێشان شتێکی هێندە بەدبەختانە نییە.

فیلیپ بە تووڕەییەوە، وتی:

– هەر هیچ نەبێ بۆ ماوەیەکی کەم دڵت خۆش و ئاسوودەت دەکا.

کوڕە گەنجەکەش، بە پەرێشانی و هیلاکییەوە، قاپووتەکەی خۆی لەبەر دەکرد، بێ ئەوەی سەیری کەس بکا، سەرخۆشانە، لەبەر خۆیەوە وتی:

– بەڵێ، بێگومان، هەرهیچ نەبێ وا لەپیاو دەکا کەمێک بیر بکاتەوە و ئەقڵی بێتەوە سەرخۆی.

ئەمەی وت و پەنجەی بۆ کەللەی خۆی برد. من لە دڵی خۆمدا، یەکسەر وتم: «ئەم کوڕە، بە تەواوەتی لەگەڵ منیەتی»، «لەوانەیە گوێی لە هەموو قسەکانی نێوان من و ڤینۆس بووبێ». «ئەقڵم بێتەوە سەر خۆم!»، «لەڕووی چییەوە؟»، «لەوەی کە گەڕان بەدووای ئەوین و جوانی، گەڕان بەدووای ئاسوودەیی و ئەو بەهەشتە میهرەبانەی لە دەستم چووە، گەڕان بە دوای وڵاتەکەم...شتێکی مەحاڵە، ناکرێ. بێهوودەیە».

ئەو کوڕە گەنجە، لەناو سالۆنەکە، شپرزە، تەماشای کەسی نەدەکرد، وتی:

– هیواداریشم ئەو قسانەی کردم، سەر و دڵی هیچ کەسێکی نەگرتبێ!

ئنجا پاشان، یەکسەر بەشپرزەییەوە، بەلەز دەستی خواحافیزی کردنی لە دەستی فیلیپ نا، بێ ئەوەی تەماشای «کچەکەی هاوڕێی یان ژنەکەی» بکات، وتی:

– من دەڕۆم، شانتال!

من لەناو بێدەنگیی دوای ڕۆیشتنی کوڕە گەنجەکەدا، تەماشای پیاوە قات سپییە یەخە بە مەدالیاکەم دەکرد. پیاوەکە یەکسەر هەستی پێ کرد کە تەماشای دەکەم. دەمودەست سەری بەرزکردەوە، چاوی بە هەوای ناو ژوورەکەدا گێڕا، ئنجا تەماشای سەرەوەی خۆی کرد، وتی:

– پووووف..! ئەم شەو مێش زۆرە!

منیش تەماشای دەوروبەری سەریم کرد، هیچ مێشێکم نەدیت. پێکەنیم، وتم:

– جەنابت، وەزیفەت چییە؟

چاکەتە سپییەکەی وێک هێنایەوە: «ئحم»، وتی:

– فرۆشیارم.

وتم: چ دەفرۆشی؟

بە ویقارێکی دڵ بڵندانەوە، وتی:





– من ژاپۆنی و عارەبان دەفرۆشم.

تەماشایەکی مەدالیەکەی سەر سنگیم کرد و بێدەنگ بووم؛ تێگەیشتم کە «ڕاسیستە». هیچی دیکەم نەگوت. لە شوێنی خۆمەوە، ماندوو، لەش داهێزراو، لەسەر کورسییەکە ڕۆنیشتم.

ژوورەکە پڕببوو لە دووکەڵ. هەستم بە ژانەسەرێک دەکرد. لەناکاو گوێم لە چرپە چرپێکی کچانە بوو، کە لە ژوورەکەی بنەبانێوە، لەلای مووبەقەکەوە دەهات. ڕاچڵەکام، بەڵام نەمدەتوانی سەرم بەرز بکەمەوە و تەماشای داڵانەکە بکەم. سەرەڕای ژانەسەر و داهێزرانی سەرتاپای لەشم، هەستم بە دڵگوشرانێک دەکرد. حەزم دەکرد بچمە دەرەوە، کەمێک هەوای سازگار هەڵبمژم. بیرم دەکردەوە: «ئێستا، هەر کە ڤینۆس دێتەوە ناو سالۆنەکە، یەکسەر پێشنیهادی ئەوەی لێ دەکەم، ئەگەر حەز بکا، ئێمەش دەچینە دەرەوە و ئەم قەرەباڵغییە دووکەڵاوییە بەجێ دێڵین»، «دەچین بۆخۆمان، لە دەرەوە، لەسەر شەقامەکان کەمێک پیاسە دەکەین، یانیش دەچین لە قاوەخانەیەک یان لە بارێکی خۆش دادەنیشین و قسە دەکەین».

کە هاتەوە ناو سالۆنەکە، هەر واشم پێ وت:

– پاشانیش ئیتر وردە وردە بەدەم پیاسەوە بەرەو مەیدانی مادلین بەڕێت دەکەم، دەتگەیەنمەوە هوتێلەکەتان. دەڵێی چی؟

پێی خۆش بوو، وتی:

– بۆ نا؟

ئەرێ بەڕاست، سەیرە، من تا ئێستاش تێناگەم، ئەو شەوەی لەگەڵ ڤینۆس ماڵی فیلیپمان بەجێ هێشت و چووینە دەرەوە، بۆچی خواحافیزیمان لە هیچ کەسێکی ناو سالۆنەکە نەکرد! بۆ؟ بەبیرم نایێ! بەبیرم نایێ کە خواحافیزیم نە لە فلیپ، نە لە سیمۆنا، نە لە ئان، نە لە هیچ کەسێکی دیکەی ئەو شەوەی ماڵی فیلیپ کردبێ! تەنێ ئەوەندەم لە بیرە، کاتێ لەسەر کورسییەکە، بەسەرخۆشی و لەش داهێزراوییەوە دانیشتبووم، دەستم درێژ کرد جگەرەیەکی دیکەی حەشیشەم لەسەر مێزە خڕە شووشەییەکەی بەردەمم هەڵگرتەوە و دامگیرساند؛ دوای قەیرێکیش کاتێ ڤینۆس هاتەوە ناو سالۆنەکە، بەیەکەوە هەڵساین و چووینە دەرەوە. سەیرە، من بەبیرم نایێ خواحافیزیم لە کەس کردبێ!

– تکایە پەساپۆرتەکانتان!

پۆلیسی ناو شەمەندەفەرەکە بوو، ڕایچڵەکاندم:

– گەیشتوونەتە «پۆخت بوو Port bou». تکایە بەڵگەنامەکانتان!

گەشتبووینە سەر سنووری ئیسپانیا. شەمەندەفەرەکە دەمێک بوو ڕایگرتبوو.

پۆلیسی سنووری ئیسپانیا، پێش هەموو شتێک، جلوبەرگە جیاوازەکەی سەرنجی ڕاکێشام. هەر لەناو دەرگای فارگۆنەکە، تەماشای یەک یەک لاپەڕەکانی پەساپۆڕتەکەمی کرد:

– گڕاسیا.

پیاوەکەی بەرامبەرم، کە سەروقژێکی بژ و تۆزاویی هەبوو، پەساپۆڕتی خۆی و ژنەکەی خستەوە ناو جەنتاکەی و سەیرێکی کاتژمێرەکەی مەچەکی کرد. بە بۆڵەیەکی ماندوو بە ژنەکەی گوت:

– سێ سەعاتی ڕەبەقە لەناو شەمەندەفەرین.

ژنەکەی، هیلاک، پشتی بە کورسییەکەی دابوو؛ لەوە دەچوو هەر زوو دیسان بکەوێتەوە شیرین خەوەوە. لە دڵی خۆمدا گوتم «پێش ئەوەی ئەم پیاوە ماندووە دیسان بکەوێتەوە خەوی شیرینەوە، با لێی بپرسم»:

– ببوورە؛ سەعات چەند دەگەینە بەرشەلۆنە؟

پیاوەکە دەمودەست پشتی لە کورسییەکە جیاکردەوە؛ زانیم لە ئیسپانییە شڕەکەی من تێ نەگەیشت؛ پرسیارەکەم دووبارە کردەوە. گوتی:

– دەوروبەری کاتژمێر یازدە دەگەینە بەرشەلۆنە.

کەمێک بۆرژابووم. هیلاک، قاچەکانم تا ژێر کورسییە چۆڵەکەی بەرامبەرم ڕاکشاند. ئانشکی چەپم لەسەر قەراغی پەنجەرەکە دانا. شەمەندەفەرەکە کەوتە جووڵە. لە پەنجەرەوە دەمدیت: دووایین کێڵگە و مەزرا و پێدەشتەکانی فەرەنسا وردە وردە تێپەڕدەبوون. لەسەر دوندی تەپۆلکەیەکی دووریشەوە، بەسەر ئانتێنێکی بەرزەوە، ئاڵای زەردوسووری ئیسپانیام کەوتە بەرچاو؛ با لێی دەدا و دەشەکایەوە.

هەستم دەکرد دەگەمەوە کوردستان و دوای ماوەیەکی دیکە – کە دەگەمە سانتیاگۆ– دایک و خوشک و کەسوکار و دەزگیرانی خۆم لە باوەش دەگرمەوە...

## 8

بۆ هاوڕێی خۆشەویستم، نەریمان...

سلاو،

لەناو وێستگەی شەمەندەفەری شاری بەرشەلۆنەوە ئەم نامەیەت بۆ دەنووسم. چەند پۆستکارتێکیشم بۆ فیلیپ و بێجان و شازاد و خەلیل و سیامەند و برادەرانی دیکە ناردووە، لەناو هەمان زەرفی ئەم نامەیەی تۆم داناون؛ تکایە پێیان بگەیەنە! یەک یەک چاوی هەمووتان ماچ دەکەم و ئاواتەخوازم هەمیشە لە بەختەوەریدا بژین.





کاتژمێر یازدە و شتێکە. نیو سەعاتێک دەبێ لە شەمەندەفەر دابەزیوم، لە قاوەخانەیەکی ناو وێستگە دانیشتووم و ئەوەتا دەمبینی: بیر لە ئێوە دەکەمەوە. چاوەڕێم نیو سەعاتێکی دیکە بەسەر بچێت و سواری شەمەندەفەر ببمەوە بەرەو سانتیاگۆ. پارەم گۆڕیوەتەوە و هەموو شتێک ئۆککەیە، گرفتم نییە. تۆ دەزانی فڕەنکی فەرەنسیی خۆمان لەچاو پەسێنتی ئیسپانی بەهادارترە؟ نانخواردنێکی باشی ئێرە نیوەی نانخواردنێکی سادەی پاریسی تێناچێ!

وابزانم کارێکی باشم کرد کە لە پاریس بلیتی ڕاستەوخۆی پاریس – سانتیاگۆم بڕی؛ ئەگینا ئێستا دەبووایە پازدە بیست سەعاتێک لەناو وێستگەی شەمەندەفەر هەر چاوەڕێ بکەم. ئەمەش لەبەرئەوەی لە بەرشەلۆنە ڕۆژانە تەنیا یەک شەمەندەفەر بەرەو سانتیاگۆ بەڕێ دەکەوێت؛ دەڵێن: سانتیاگۆ مەڵبەندێکی دوورەدەست و لاچەپە، واپێدەچێ هاتوچۆی – لەچاو شارۆچکەکانی تر – کەمتر بەسەرەوە بێت. چەند دەقیقەیەک پێش ئێستا، چووم تەماشای نەخشەی ئیسپانیام کرد؛ حەزم دەکرد بزانم ئاخۆ ئەم شارۆچکەیەی من بۆی دەچم، کەوتۆتە کوێی ئیسپانیاوە؟ تەماشا دەکەم: دووایین شارۆچکەی سەر سنووری ئیسپانیایە و دەکەوێتە باکووری ڕۆژئاوای ئیسپانیا، ئیدی هێندەی نامێنێ بگەمە قەراغەکانی ئۆقیانووسی ئەتلەسی. خەلیل هەقی بوو کە دەیگوت: «دارا سەری خۆی هەڵدەگرێ بەرەو جەزیرەی واق واق». سلاوی لێ بکە.

ڕاستییەکەی، حەزناکەم لە بەرشەلۆنە بمێنمەوە. کە لە پاریسیش بووم هەر وام بڕیار دابوو. هەرچەند بەرشەلۆنە شارێکی زۆر خۆشە و ئەمە دووەم جارمە دێمە ئەم شارە. بەڵام وەک پێش ماوەیەک لەناو مەیدانە ئاپوورەکەی بەردەم وێستگە هەستم پێ کرد: ئێرە، لەچاو پاریس، زۆر گەرمترە. هەرچی گەنج و کوڕ و کاڵ و کچی جوان هەن، لە بەردەم ئەو وێستگەی شەمەندەفەرە، خۆیان نیووەڕووت کردۆتەوە، بە تاقە فانیلە و شۆڕتێکەوە لەناو مەیدانەکە تاک تاک، جووت جووت، دەستە دەستە، جەنتاکانی سەفەریان کردۆتە سەرین و لێی پاڵ کەوتوون. دیارە، بێگومان، زۆربەیان، بە شەویش هەر، لەم مەیدانە ئاپوورەیەدا دەنوون: چونکە ئێرە ئەگەر بە ڕۆژ هێندە گەرم بێت؛ دەبێت شەوەکەی زۆر فێنک بێت. هەر چۆنێک بێ، مەیدانە خۆشەکەی بەردەم وێستگەی شەمەندەفەری بەرشەلۆنە هوتێلێکی گەنجانەی بەلاشە بۆ

ئەو گەڕیدە و لاکەوتە و موسافیرانەی وەکوو من.

نەریمان گیان، هاوڕێم..

پێش ئەوەی بگەمە بەرشەلۆنە، شەمەندەفەرەکە تازە گەیشتبووە ناو ئیسپانیا و یەکەمین شارۆچکەکانی ئیسپانیای تەی دەکرد. کاتێ خاوی کردەوە، لە پەنجەرەوە قازم دیت. قازی بالّ مەیلەوڕەش و خۆلّەمێشی، تەواو وەک ئەو قازانەی لای خۆمان کە کەمێک سیان و چلّکیشیان پێوە بوو (نەک وەک ئەو قازانەی کە هەر دەلّێی تۆپەلّێک ئارمووشی سپیی بێ گیانن کە لە نەرویج یا لە فەرەنسا دەیانبینین) کاتێ چاوم بەو قازانە کەوت دلّم زۆر خۆش داهات، هەستم دەکرد لە کوردستانم و دیسانەوە چاوم بە هەلّەبجەی شارەکەی خۆم دەکەوێتەوە. من زۆر لەمێژ بوو قازم نەبینیبوو. لێرە، لە ئیسپانیا، بینیمن: زۆر جوان و بەدەو، لە دەم بەستەکاندا قونەقونیان بوو.

بەست! بەست بە هەمان پاشماوەی ئەو ئاو و ئاوەڕۆ چک کراوانەی خۆیانەوە لەسەر ڕێگەی بەرشەلۆنە هەن. دارسپیندار. سەوزیی سروشتی. پەنجەرەی کۆن. سەربانی قەرەبالّغ. کۆللارەی مندالاّن. ڕستە و تەنافی جلوبەرگ هەلّواسراوی لای خۆمان ئاسایی. گوفەک. کەر. کەر، کە من لەوەتەی لە ئەوروپام.. غەریبیی دەکەم. دەیان ژیان و شتی جوانی دیکە. من سەیرم پێ دێ: ئیسپانیا چۆن توانیویەتی ئەو هەموو شتە کۆنە جوانانە بە دەقی خۆیان هەتا ئێستاش هەر بپارێزێ؟ بەکورتی: لە ئیسپانیا هەست دەکەم لە هەلّەبجە و کەرکووک و دیالە و ئەو مەلّبەندانەی کوردستانم.

نەریمان گیان،

شەمەندەفەرەکەم سات یازدە و پەنجا دەقیقە بەڕێ دەکەوێ. بۆ سبەینێ سات یەک و نیوی دوای نیوەڕۆ دەگاتە سانتیاگۆ. واتە من دەبێ نزیکەی بیست و شەش سەعات لەناو شەمەندەفەر بمێنمەوە. دلّم بەوە خۆشە کە باڕ و کافتیریاکەی ناو شەمەندەفەر بەدرێژایی ڕێگا کراونەتەوە؛ تەنیا شەوەکەی نەبێت کە لە کاتژمێر دووازدەوە تا نۆی بەیانی دادەخرێت. لەم ماوەیەدا، بێگومان دەتوانم هەر لەناو کافتیریای شەمەندەفەرەکە بۆ خۆم دانیشم سکێچ بکەم یان بخوێنمەوە. بۆڕد و ستاندەکەم لە توولّووز فڕێدا، دامە نیگارکێشێکی پەڕپووت کە لە مەیدانێکی ناو شاری توولّووز پۆرترێتی دەکرد. دامناوە هەرکە دەگەمە سانتیاگۆ بۆرد و ستاندێکی





تازە بکڕم.

دلّنیابە هەرکە دەگەمە سانتیاگۆ، ناونیشانێکی خۆمت بۆ دەنێرم و لە هەوالّی خۆم ئاگادارتان دەکەمەوە.

هاوڕێی دلّسۆزت: دارا

لە چێشتخانەی «پیگال»، لە گەڕەکی مۆنماخت، لەو چێشتخانەیەی کە هەموویان ڕاهاتبوون زۆربەی ئێواران لەوێ کۆببنەوە؛ نەریمان، خەلیل، سیامەند، دختۆر نووری، بێجان.. لە دەوری مێزێک دانیشتبوون؛ نەریمان تەواوی نامەکەی دارای بۆ خوێندنەوە. هەرکە نەریمان دیماهی بە دووایین ڕستەی نامەکە هێنا، بێجان گوتی:

– خەلیل، تۆ فیلیپ زوو زوو دەبینی؛ پێی خۆش دەبێ ئەگەر هەوالّی دارای پێ بگەیەنیت.

– «نامەی تایبەتی» بۆ ئەو ناردووە، قوربان...

سیامەند بوتلّێک شەرابی «بۆژۆلێ» تازەکەی بەدەستەوەبوو، یەک یەک بۆ هەموویانی تێکرد:

– بە هیوای سەرفرازیی دارای برادەری دوورەولاّتمان.. نۆش!

کە پەرداخەکەیشی دانایەوە، غەمگین غەمگین دەتگوت دەلاّلێتەوە:

– شوان قەرزێکی وەرگرت و ڕایکردە کەنەدا، خەسرۆ ژنێکی پۆلّۆنیی هێنا و چووە وارشۆ، زیرەک زیرەکانە زەمالەیەکی ئوسترالیای بۆ خۆی پەیدا کرد و خۆی گەیاندە سیدنی، ئەوا داراش «کەس نازانێ بۆچی» تێی تەقاندە ئیسپانیا. بەشەرەفم لەوە دەچێ ئەم پاریسە بەختی نەبێ: هیچ کوردێکی تێدا نامێنێتەوە!

بێجان گوتی:

– دارا دەگەڕێتەوە.

– ناگەڕێتەوە.

– دەیبینی. هەر دوو هەفتەی دیکەیە!

خەلیل قسەی هەردووکیانی بڕی:

– بۆ بگەڕێتەوە؟ بۆ خۆی ژنێکی دەولّەمەندی ئیسپانیی دۆزیوەتەوە کە کێلّگە و باغ و باغاتێکی هەیە تەنانەت تا حەوت پشتی داراش بەشیان دەکا.

– کێ وا دەلّێ؟

– لای گابرییێل باسی کردبوو.

– کام گابرییێل؟

– نیگارکێشە یۆنانییەکەی لای خۆمان.

دختۆر نووری رووی لە خەلیل کرد؛ حەزی دەکرد بزانێ:

– ژنەکە پیرە؟.. کەترەیە؟

– شازاد دەڵێ: بیست ساڵەیەکی بلۆندە، دڵت نایە تەماشای بکەی!

خەلیل بە گاڵتە پێکردنەوە رووی لە قسەکەی بێجان کرد:

– شازاد لە کوێ بینیویەتی؟

سیامەند پێکێکی دیکەی هەڵدا، دەیویست مەتەڵەکە هەڵبهێنێ:

– شازاد خۆی نەیبینیوە؛ دارا بۆی باس کردووە.

خەلیل گوتی:

– درۆیە. من باوەڕناکەم.

نەریمان گوتی:

– فیلیپ دەیگوت: «من پێم وابێ دارا ئەو کچە ئیسپانیایەی لە ماڵی ئێمە ناسی». دەیگوت: «شەوێک دەعوەتم کردبوو؛ وابزانم ئەو کچەی لەو دەعوەتەی ماڵی ئێمەدا ناسی».

خەلیل هەڵیدایە:

– یەعنی، دارا، عەیب نەبێ، ڕەدووی ژنان کەوت؟

سیامەند گوتی:

– سەیرە! لە نامەکەیدا باسی هیچیش ناکا.

«دختۆر نووری» دیاربوو دەستی لە خواردنەوە کشاندبۆوە، کەوتبووە سەر نانخواردن:

– ئیشێکی گەلەک باشی کردووە.

– ئیشی باشی چیی کردووە؟ خەلیل پرسی.

– کە ڕەدووی ژنان کەوتووە.

– بۆچی چما لێرە ژن نییە، هەی لە ئەو نەگبەتتر!

– ژنێک بەخێومان کات و کرێی خانوومان بدات و کێڵگە و ڕەز و باغاتی خۆمان بەناو بکات..

– نە وەڵڵا نییە.

– کوا؟ دەی بۆ منی بدۆزەوە تا بیخوازم!

– ئنجا خۆ بۆ تۆ، ئەگەر تۆ خۆشت بەخێوی بکەیت و کرێی خانووی بدەیت و کێڵگە و باغاتی خۆتی بەناو بکەیت.. هەر دەست ناکەوێت؛ هەی کەرە!

دختۆر نووری کەوتە بەرگریکردن لە خۆی:





– من ئەسڵەن ژنی ئێرە هەر ناهێنم.

خەلیل کەوتەوە قسە:

–وەک هەندێ لە کوردە پەناهەندەکانی ئەسکەندەنافیا بچۆرە پۆڵۆنیا! دەڵێن: کچە پۆڵۆنی هەرکە سەرڕەشێک یەک دۆلاریان نیشان دەدات؛ ئیتر یەکسەر فس دەبنەوە و بەدووات دەکەون بۆ هەر کوێیەکی خۆت حەزبکەی.

دختۆر نووری لوقمەی لە دەمدا بوو، بە خەلیلی گوت:

– تۆ جارێ بۆ خۆت ژنێکی شەریف بێنە؛ عەلاقەت لە خەڵکی تر نەبێ!

خەلیل، رووی لە بێجان، لمۆزی خوار، گاڵتەی بە عەقڵی دختۆر نووری کرد:

– جەنابی دختۆر هێشتا بۆ خۆی ژنێکی ناشەریفی پێ نەدۆزراوەتەوە، دەیەوێ ئێمە ژنێکی شەریف بدۆزینەوە!

نەریمان ناچار بوو بکەوێتە ناوبژیيانەوە و فیلێک بۆ پچڕاندنی ئەو گفتوگۆیە بدۆزێتەوە:

– کوڕینە، دەزانن: دەشتی سێ ڕۆژە لە بەندیخانە دەرچووە و تا ئێستا سەرێکمان لێی نەداوە!

– ئەرێ بەڕاست ئەوە چی بوو؟ لەسەر چی گیرابوو؟

بێجان وەڵامی سیامەندی دایەوە:

– لەسەر هێلکە.

– هێلکەی چی؟

خەلیل گرژییەکەی خاوبۆوە:

– ئەی! ئەویش هێلکەی قاچاغی لەرێگەی ئەلزاسەوە دەبرد بۆ زووریخ؛ لەوێ بە پارەی شەش قات دەیفرۆشتەوە.

– یەعنی دەشتی لەسەر سنووری فەرەنسا و سویسرا قاچاغچێتیی هێلکەی دەکرد؟

– ئەدی چی؟ دەزانی چ پارەیەکی دەست دەکەوت!

– ئەرێ (پۆلا) چ دەکا؟

– چ دەکا!.. پشیلەکەیشی لەگەڵ خۆی ڕزاندۆتەوە.

– چۆن؟

– ئەی! ئەم خۆی لە کونی ژوورەوە ناوە و نەگبەت نەگبەت نایەتە دەرەوە؛ پشیلەکەیشی لەگەڵ خۆی سجن کردووە.

– ئنجا بۆ نایەتە دەرەوە؟

– دەڵێ: «ئاوها مەسرەفم سووکترە».

– مووچەی بەلەدییەکەی بەشی ناکا.

– ئنجا بەشی کێ دەکا!

– چاکتر وایە ئەویش ژنێکی کەترەی ئیسپانی بۆ خۆی بدۆزێتەوە و ئەویش بچێتە سانتیاگۆ..؟

خەلیل بەدووای ناوی شارەکەدا دەگەڕا.

–...دی کۆمپۆستێللا.

– سانتیاگۆ دی کۆمپۆستێللا.

نەریمان بە ئاوازی ئامۆژگارییەوە ڕووی لە خەلیل کرد:

– خەلیل گیان، ئەگەر ئێستا شازاد لێرە بووایە، دیسان دەستەویەخەی یەکتر دەبوونەوە. ئەم دیعایە قۆڕانە بۆ دارا بڵاومەکەوە. عەیبە!

– ئنجا دیعایەی چیم کردووە؟ من باسی پۆڵای نەگبەت دەکەم. پارەی بەلەدییەکەی بەشی ناکا..

– ئنجا خۆ تەنیا ئەو حاڵی وا نییە!

دختۆر نووری ڕووی لە خەلیل کرد:

– بەخوا، تۆ، تەنیا شازاد دەرەقەتت دێ.

– ئاخر ئەمیش؛ پارەی بەلەدییەکەی، بەشی ناکا.

– ئەگەر ئێستا شازاد لێرە بووایە، پێتی دەگوت: تۆ بۆ خۆت بە هۆی پۆرترێت و بازرگانیکردن بە هونەرەوە لە مۆنماخت بوویتەتە ملیۆنێر، خەڵکی دیکەشت کردۆتە تیزەسارەی خۆت.

خەلیل بێ ئەوەی هیچ نیشانەیەکی تووڕەبوون بە ئادگارییەوە دیار بێت، گوتی:

– دختۆر نووری، من با تەنیا یەک قسەی جیددی لە ژیانمدا بە تۆ بڵێم!

– فەرموو.

– ئێمەی پەناهەندە و دوورەوڵات، نەک تەنیا لە فەرەنسا بەڵکو لە هەموو ئەورووپا، تەنیا سێ ڕێگەچارەمان لەپێشدایە.

نووری بە گاڵتەکردنەوە بە خەلیل گوتی:

– یەکەم:

– تەسلیم ببینەوە بەعسی دکتاتۆر؛ حیزی و سەلامەتی، بچین عەسکەرییەکەی خۆمان بکەین.





– دووەم:

– ژنە پۆڵۆنییەک یان پیرەژنێکی کەترەی ئەم ئەورووپایە بدۆزینەوە کە ببێتە مایەی خۆشگوزەرانی و بەختەوەریمان؛ بەخێومان بکات و داڵدەمان بدات «یان هیچ نەبێ فێری زمانەکەمان بکات»... کە ئەمەش چارەسەرێکی وەختییە. ها!

– ئەدی سێیەم؟

– سێیەم ئەوەیە کە تۆ بتوانیت بنجی خۆت واقیعییانە لە ئەوروپا ڕەگاژۆ بکەیت، وەک ئەمان و لەگەڵ ئەمان بژیت، کاکی خۆم!

دختۆر نووری بیری دەکردەوە:

– وایە...

– ئنجا لەم کاتەشدایە کە تۆ فێر دەبیت چیتر باسی ژنی بەشەرەف و بێ شەرەف نەکەیت.

– ئنجا لەم کاتەشدایە کە تۆ فێر دەبیت وڵات و ئەخلاقی میللەتی خۆتت لەبیر بچێتەوە.

خەلیل کەوتەوە گاڵتەکردن بە دختۆر نووری:

– فەرموون، جەماعەت.. هاتەوە سەر یاسینی گۆلکێ! باشە، ئێستا تۆ، کام ڕێگەچارەت بە لاوە پەسەندە؛ هەی حافز ئەسەد!؟

– من دەڵێم: بەداخەوە..

– چی بەداخەوە؟

– ئێمە، هەموومان لە ئەورووپا چەند پرۆژەیەکی تەئجیلکراوین.

نەریمان و بێجان و سیامەند، پێش هەمووشیان خەلیل، بەم قسەیەی دختۆر نووری، دایانە قاقای پێکەنین.

کە لە پێکەنینە ناکاوەکە کڕبوونەوە، بێجان پێش ئەوەی پێکی بۆژەلێکەی هەڵبدا، پرسی:

– دختۆر نووری؛ چۆن؟

– توو شەرەفتان مەگەر وا نییە؟ لێرە هەموومان ژیان و پرۆژەکانی خۆمان تەئجیل کردووە بۆ ئەو کاتەی کە صەدام حسێن و خومەینی و ئەسەد و بولێند ئەجەوید.. لەناودەچن!

دختۆر نووری لەبەر پێکەنینی ئەوان فریا نەدەکەوت بۆچوونەکەی خۆی ڕوونتر بکاتەوە:

– ئەوەتا شازاد دکتۆراکەی تەواو کردووە و چاوەڕێ دەکا صەدام بڕووخێت و

بگەڕێتەوە کوردستان و لە زانکۆ دەرس بڵێتەوە. نەریمان خۆی هەڵگرتووە بۆ ئەوەی دەوڵەمەند ببێت و گەلەرییەکی نەتەوەیی کوردی بە ناوی «گەلەریی کوردستان» لە مۆنپەرناس بکاتەوە و تەنیا تابلۆی هونەرمەندانی کورد لەو گەلەرییە بفرۆشێتەوە – خواش دەزانێ کەی دەوڵەمەند دەبێ!– ئەوەتا کامەرانیش، کامەرانی بەدبەخت، چاوەڕێ دەکا هیچ نەبێ هاتوچۆ بکرێتەوە بۆئەوەی کچەمامە مارەکراوەکەی خۆی بگەیەنێتە لای خۆی. ئێ... ئەوەتا سوداد گەردی کتێبێکی فۆلکلۆریی دەشتی هەولێری کۆکردۆتەوە و دوو ساڵە هەر چاوەڕێ دەکا: نازانێ لەکوێ چاپی بکا!

– وەڵا ڕاست دەکا، شەماڵی شاعیری هاوڕێشمان لە بەرلینەوە نامەی ناردووە، دەڵێ «شیعر نانووسم تا ئەوکاتەی بەتەواوەتی فێری ئەڵمانی دەبم، بۆئەوەی بتوانم لەمەودووا یەکسەر شیعر بە ئەڵمانی بنووسم و شۆرەت پەیدا بکەم».

برادەرەکانی دختۆر نووری کولابوون لەناو پێکەنیندا. بێجان هەر پێدەکەنی، پچڕ پچڕ توانی قسەیەک بکات:

– دارا.. بۆ خۆی.. ڕۆ.. یشت... ها؟

ئنجا خەلیل مەبەستەکەی بۆ تەواوکرد:

– دارا.. تەحەمولی.. نەکرد.. چیتر.. خۆی.. تەئجیل.. بکات.

لەو دەمەدا بوو، شازاد وەژوور چێشتخانەکە کەوت و گەیشتە سەر مێزەکەی ئەوان:

– چییە ئەوە! دیسان باس باسی دارایە؟

خەلیل پێکەنینی ڕانەدەوەستا، کورسییەکی بۆ شازاد ڕاکێشا:

– وەرە دانیشە شازاد! دارا...

– دارا چی؟

– دەزانی بۆچی دارا ئەو پاریسە خۆشەی بەجێ هێشت و سەری خۆی هەڵگرت؟

– بۆ؟

– چونکە...

خەلیل هەر پێدەکەنی. شازاد پرسی:

– چونکە چی؟

– دارا.. تەحەمولی نەکرد.. چیتر.. خۆی تەئجیل بکات.

## 9

لیباردۆ، باوکی کۆڵۆمبی، دایکی پورتوگالی، لە پاریس لەدایک ببوو. چوار ساڵ بوو یەکترمان دەناسی. فۆتۆگرافێکی هونەرمەند بوو. هەموو ئێوارەیەک تا نیوەشەو، کامێرا لە شان، دەم بە جگەرەیەکی چرووتەوە، لە مۆنماخت دەمایەوە؛ بازاری هەمیشە





زۆر گەرم بوو: چونکە لەپاڵ ئەوەی کاری بۆ گەلەری و نیگارکێشەکانی مۆنماخت دەکرد، قازانجێکی باشیشی لەڕێگەی تووریستەکانی مۆنماختەوە دەست دەکەوت. دەستێکی جوانی نیگارکێشانی هەبوو، بەڵام هەرگیز حەزی نەدەکرد پیشانگا بکاتەوە و تابلۆکانی بداتە گەلەرییەکان. گەلێک ئێواران، دوای کار، لە باڕی «دێ فلۆر» کە باڕێکی بێدەنگ و خۆشی مەکسیکی بوو لە مۆنماخت، بەیەکەوە نانمان دەخوارد. ئێوارەیەک، دوای مشتومڕێکی زۆر، دەیویست دەرگای گفتوگۆکەمان کلیل بدات، گوتی:

– هەر چۆنێک بێ.. باشتر وایە ئێمە هەموومان سەری خۆمان بەرەو هیندستان هەڵگرین و بچین بەیەکجاری لە هیندستان بژین!

منیش، کە هەستم دەکرد هەمیشە شتێکی نامۆ و سەیرتر لەناو دەروونی لیباردۆدا حەشاردراوە، گوتم:

– بۆ بچینە هیندستان؟

لیباردۆ گوتی:

– لەبەرئەوەی ئەورووپا خوای تێدا نەماوە. لە ئەورووپا خوا مردووە... دەمێکە مردووە.

منیش کەمێک بە سەرسامییەوە، پرسیم:

– ئنجا ئەمە پەیوەندیی بە قسەکەمانەوە چییە؟

– هیندستان هێشتا پڕە لە خواکان! ئێمەی هونەرمەند هەموومان پێویستە بچینە ئەوێ و.. دوعا بکەین! لە خواکان بپاڕێینەوە کە بەختێکی باشمان پێ ببەخشن، لە خواکان بپاڕێینەوە کە مرۆڤ بەختەوەر بکەن و ئەم جیهانەمان پاک ببێتەوە!

بە لیباردۆم گوت:

– باشە، عیراق و ئێران.. خۆ ئەورووپا نین و پڕیشن لە خوا! ئەدی بۆچی ئەوە زیاتر بۆ حەوت ساڵ دەچێ بە گوللە و تۆپ و گازی کیمیاوی کەوتوونەتە گیانی ڕۆڵەکانی خۆیان؟

– من قسەم لەسەر واقیعەکە نییە، هیچ وڵاتێکی دنیا بێ گەندەڵی نییە. من قسەم لەسەر ئەوەیە کە هیندستان و ڕۆژهەڵات، بەختەوەرانە، هێشتا خوایان تێدا ماوە.

– باشە، ئاخر منیش هەر باسی ئەوە دەکەم. خەڵکی «ئەو هیندستان و ڕۆژهەڵاتەی تۆ باسی دەکەی» لەوەتەی هەن نوێژ دەکەن و لە خوا دەپاڕێنەوە؛ ئەدی بۆچی ژیان لەوێشدا هەر لە خراپەوە بۆ خراپترە؟

لیباردۆ پێدەچوو هەستی پێکرد بۆچوونەکەی بەتەواوەتی ڕاست نەبێ:

– ئێمەومانانی ئەورووپایی، ئەمڕۆ، پێمان وایە هیچ نەبێ تۆزقاڵێک ڕۆحانییەت و

سۆز لە ڕۆژهەڵاتدا هێشتا هەر ماوە.

– من وابزانم ئەم قسەیەی تۆ لەبارەی ڕۆژهەڵات، تەنیا لەبارەی کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمەوە ڕاستە: ئەو وەختەی ڕۆمانسییە ئەورووپاییەکان بەلێشاو ڕوویان دەکردە ڕۆژهەڵات.

– مەبەستت: ئێستا شتەکان تەواو بەپێچەوانەوەن؟

– من وا ناڵێم.

– ئەدی؟

– گرنگ ئەمەیە: هونەرمەند لە هەر کوێیەک بێت، لە هەر حاڵەتێکدا بێت، دەتوانێ «خوایەک» بۆ خۆی بدۆزێتەوە.

– تەنانەت لە ئەورووپاش؟

– بێگومان.

– بەڵام نیتشە صەد ساڵ زیاترە ئێمەی ئەورووپاییی ئاگادار کردۆتەوە کە لە ئەورووپا «خوا مردووە..». تەواو.

– «ئەگەر خوا نەشبێت؛ تۆ خۆت دەبێ دروستی بکەی!».

لیباردۆ پەرداخی ریکاردەکەی دانایەوە و دەمی خۆی سڕییەوە:

– کەواتە، ئەمەی تۆ باسی دەکەی خوا نییە؛ بەڵکوو تەنیا وەهمێکە.

– ئەسڵەن هونەرمەند بەبێ وەهم ناژیت.

– چۆن؟

– هونەرمەند هەمیشە پێویستی بە وەهمێک هەیە؛ بەبێ وەهم ناتوانێ بژیت و داهێنان بکات.

– بۆ؟

– ئەم وەهمە دڵی دەداتەوە و ئومێدێکی پێ دەبەخشێ... وەهم زۆر جوانە، لیباردۆ! وەهم ڕزگارت دەکا.

– کەواتە، مەسەلەی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا کۆتایی پێ هات: هیچ گرنگ نییە هونەرمەند لەکوێ بێت؟

– بێگومان گرنگ نییە؛ چونکە هونەرمەند هەمیشە لەناو وەهمێکدایە. ئیتر ئەم وەهمە هەموو کەسێکی ئەوە؛ وەهم هەموو شوێنێک و هەموو کەسێکە بۆ ئەو.

لیباردۆ گوتی:

– یەک شت دەمێنێتەوە.





– چییە؟

– هەندێ شوێن هەن ڕێگەت لێ دەگرن کە بتوانیت وەهمێک بۆ خۆت دروست بکەیت.

لیباردۆ دامابوو، بیری دەکردەوە:

– ئەمە بەڕاستی کارێکی قورسە.

– چی؟

– کە بتوانیت وەهمێک بۆ خۆت دروست بکەیت و ڕزگارت بکا.

– بەڵێ، بێگومان. هونەرمەند لەو خەڵکە دەگمەنانەیە کە توانای ئەوەی هەیە وەهمێک بۆ خۆی دروست بکات. تەنیا ئەم وەهمە ڕزگاری دەکا. ئەم وەهمە بۆ هونەرمەند بەتەواوەتی بریتییە لە ئەڵتەرنەتیفێک.

– ئەڵتەرنەتیفی چی؟

– ئەڵتەرنەتیفی واقیعێک، بەهەشتێک، ئاسوودەیییەک.. کە تۆ لەدەستت چووە یان کە هەست دەکەی هەرگیز ناتوانیت وەدەستی بهێنێت!

نازانم بۆچی، لەناو کافتیریای شەمەندەفەرەکەدا، بەدەم کێشانی سکێچێکەوە، ئەم گفتوگۆیەی خۆمم لەگەڵ لیباردۆ هاتبۆوە یاد!

پێنج سەعات زیاتر بوو لەناو شەمەندەفەرەکە بووم. تازە لە خەو هەڵسابووم، کورسی و فارگۆنەکەی خۆمم جێهێشتبوو؛ بۆ خواردنەوەی بیرەیەک و نانخواردنێک هاتبوومە کافتیریاکە. گۆشەگیر، لە سووچێکی کافتیریاکە دانیشتبووم و سەرگەرمی کێشانی سکێچێک بووم.

زۆر سەیرە! لەم ڕۆژانەدا هەرکە دەستم دەدایە پێنووسە فەحمییەکەم و دەمویست سکێچێک بکەم، دەمودەست دیمەنی حەوشەی ماڵەکەمان دەهاتە پێش چاو لە هەڵەبجە. هەوڵم دەدا لەدەست ئەو وێنەیە خۆم ڕزگار بکەم کە هەمیشە دەهاتەوە بەر دیدەم: خوشک و برا و سەرتاپای منداڵەکانیان، لەگەڵ دایکم و باوکم.. لەناو حەوشەی ماڵەوەدا، لەژێر تەپوتۆزێکی شینی کیمیاویدا کەڵەواژ ببوونەوە. لە نێزیک ئەواندا: سۆندەیەکی سووری درێژ، وەک لاشەی مارێکی ئەستووری زەبەللاح، لەناو حەوشەکەدا کوژراو؛ لەملاتریشەوە چەند تاکە نەعلێکی لەهۆشخۆچوو، لەگەڵ پەیژەیەک کە هەتا هەتایە هیچ کەسی تری بەرەو بانیژەکە پێ سەرناکەوێ...

ئەم دیمەنە، هەموو دەم، لەوکاتانەی دەستم دەدایە پێنووسە فەحمییەکەم دەهاتەوە پێش چاوم. بە خۆمم دەگوت: «چی بکەم»، «کێ وەک منە؟»؛ «سەرجەم خانەوادە و خۆشەویستانت لە ماوەی چاوتروکانێکدا لەناوبچن و خۆشت لە غەریبیدا..!».

– ئەمە بەڕاستی کارێکی قورسە.

– چی؟

– کە بتوانیت وەهمێک بۆ خۆت دروست بکەیت و ببێتە ئەڵتەرنەتیفێک.

لەناو کافتیریای شەمەندەفەرەکە دڵی خۆم تەنیا بەوە خۆش دەکرد کە چەند سەعاتێکی دیکەیە و ئیتر دەگەمە سانتیاگۆ.

– لە سەرەتادا خانوویەکی بچکۆڵەت بۆ بەکرێ دەگرم.

ڤینۆس ئەمەی پی دەگوتم. منیش دەمگوت:

– ئێواران جاربەجار بۆ خۆشم دەچم کاردەکەم: لە باخچە و مەیدان و شوێنە گشتییەکاندا ستاند و بۆردەکەم هەڵدەدەم و پۆرترێت بۆ خەڵک دروست دەکەم.

–بەڵام من بۆ خۆم دێم خانووەکەت بۆ دەڕازێنمەوە.

– دیوارەکانی هەمووی بە ڕەنگە جوانەکانی میهرەبانیی تۆ نەخش دەکەم.

– ژوورێکت بۆ جیادەکەمەوە بۆ ستۆدیۆکەت.

– منیش بۆ خۆم خواردنی کوردەوارییانەی خۆمانت بۆ لێ دەنێم.

ڤینۆس دەیگوت:

– نەء ؛ تۆ دانیشە. بۆ خۆت هەر ڕەسم بکە!

– ڤینۆس گیان، ڕەسمی من تەواو نابێ.

– لە سانتیاگۆ هەر ڕەسم بکە.. هەر ڕەسم بکە... هەتا ئیتر دەبینی: هەموو وەهمەکانت بوونەتە واقیع!

من بەبیرمە: کە لەگەڵ ڤینۆس دەبووم و لەگەڵی دەکەوتمە گفتوگۆ، هەمیشە چرپەچرپێکی دوورەدەست دەهاتە گوێم؛ لەوە دەچوو لە شوێنێکی نزیک منەوە باڵندەیەک خەون ببینێ یان چەند تاڵە گیایەک لە دوورەوە بیانەوێ بروێن و سەر دەربکەن.

لە پەنجەرەی کافتیریاکەوە، دەمدیت: بەپێچەوانەی ئاپارتمان و بازاڕی ئاپوورە و جمەی ئوتومبیلەکانی پاریس؛ مێرگ و کەژ و دەشتی سەوز، ئەسپ و باڵندە و مێگەلی مەڕ.. وردە وردە وەدیاردەکەوتن. ئەگەرچی من نەمدەزانی ئاخۆ ئێستا لە کوێم و ناوی ئەم مەڵبەندەی پێیدا تێپەڕ دەبین چییە، بەڵام ڕەنگی ئەم دیمەنە تازە سروشتییانە، وەک ئاوازێکی خۆش دادەڕژایە کانگامەوە، مێشکی ماندووی هێمن دەکردەوە. پڕ بە دڵ حەزم دەکرد تا دەگەمە سانتیاگۆ، هەرگیز ئەو پەنجەرەیە جێ نەهێڵم و هەر تەماشای ئەم سروشتە پاکە ئارامبەخشە بکەم.

لەناکاو زەردەخەنەیەک کەوتە سەر لێوم، بە خۆمم گوت: «ئەو شوێنەی بۆشی دەچم، سەیرە؛ نازانم کوێیە. هەرگیز نەمدیوە!».





ڤینۆس پێی دەگوتم:

– مەڵبەندێکی تا بڵێی قەشەنگ و دڵگیرە. هەرکە لێی نزیک دەبیتەوە، هەر کەژ و چیای ڕەنگاوڕەنگە، هەر ڕووبار و ڕەز و باغاتە دێنە پێشوازیت. ئاسمانەکەی پەڵکەزێرینەی لێ نابڕێت. هەوایەکی تا بڵێی خۆش و سازگاری هەیە.

دەیگوت:

– ئەگەر بێی، بەڕاستی، سەرت لەو جوانییە ئەفسووناوییە سوڕ دەمێنێ.

منیش دەمویست لە هاتنی خۆم ئەرخاینی بکەمەوە:

– سروشت، بەڕاستی، گیانێکی دیکەم بەبەردا دەکاتەوە.

– بە تۆ بێ: هەرگیز ئەوێ بەجێ نەهێڵی!

بە ڤینۆسم گوت: ڤینۆس..

– بەڵێ.

– من ماوەیەکی زۆری ژیانم لە پاریس، هەر بۆ خانوو دەگەڕام و هیچ خانوویەکم دەست نەدەکەوت. هەندێ شەو دەچوومە ماڵە هاوڕێکانم، هەندێ شەوانیش تا بەرەبەیان لە باڕەکان دەمامەوە، زۆربەی شەوانیش هەر لە دەرەوە لە قاوەخانەکاندا یان بەدەم پیاسە ڕۆژم دەکردەوە. شەوێک لەو شەوانەی بێکەسی و بێ ماڵیی خۆم، لەسەر شەقامێکەوە سەرم هەڵبڕی تەماشای بالکۆنێکم کرد. سەگێکم بینی، هەر دوو دەستی بەسەر شیشەکانی شوورەی بالکۆنەکەوە گرتبوو و تەماشامی دەکرد. من بێ ماڵ لەوکاتەدا زۆر بەزەییم بە خۆمدا هاتەوە، لە دڵی خۆمدا پێکەنیم، بە خۆمم گوت: «هەیهات! کە لە کوردستان بووم، من لە بالکۆنەوە تەماشای سەگم دەکرد؛ ئێستاش لە ئەورووپا سەگ لە بالکۆنەوە تەماشای من دەکات».

ڤینۆس بەم قسەیەم زۆر پێکەنی. پاشان وتی:

– وەیش... قوربانت بم.

منیش گوتم:

– ئەوا زیاتر لە حەوت ساڵە لەناو ئەو پاریسە ئاپوورەیەدا پیشام؛ هەمیشە «مێترۆ، بوولۆ، دۆدۆ».

ڤینۆس گوتی:

– وەرە.. وەرە بۆ لای من.. دارا!

گوتم: بەڵام هەتا کەی؟ هەتا کەی؟

ڤینۆس پەنجەکانی هەر دوو دەستی ڕۆکردە نێو قژم. سەرمی بە سنگی خۆیەوە نا؛ هەستم بە گەرمایی هەناسەی دەکرد، گوتی:

– تا ئەو کاتەی خۆت حەزدەکەی.. تا هەتایە.

ڤینۆس پەنجەکانی بەناو قژمدا دەگەڕاند و دەیلاواندمەوە:

– لەوێ، چوار پێنج بێستانی گەورەمان هەیە، لەگەڵ کێڵگەیەکی تا چاو هەتەردەکا هەراو. لەوێ، باوەشی ئەو سروشتە بەهرەی جوانترین تابلۆکانی ژیانت دەداتێ. هونەرەکەشت گیانێکی تازە و خوێنێکی تازەیان بەبەردا دەکرێتەوە. لەوێ، لەمەودووا، نە جیهان بۆ من چیتر ئەو گوندە بچووکە دەبێت و نە بۆ تۆش چیتر ئەو زیندانە گەورەیە!

بەدەم بیرهاتنەوەی ئەم قسانەی ڤینۆس، لەناو شەمەندەفەرەکەدا، خەیاڵ بردبوومیەوە؛ شارۆچکە خنجیلانە وێرانکراوەکەی خۆمانم وەبیردەهاتەوە: هەڵەبجە، کەژ و کێوە ڕەنگینەکانی، چیا سەرکەشەکانی، ڕەز و بێستانە پاراوەکانی، دوو ئاوانە میهرەبانەکانی «ئەحمەد ئاوا»، نسێ و دارستانەکانی «گوڵان». یەکە یەکە دەهاتنەوە پێش چاوم و دەمدین: لەگەڵ ڤینۆس دە دووازدە ساڵ گەنجتر ببوومەوە؛ لە کێڵگەکاندا بەیەکەوە زرعاتمان دەکرد؛ لە پێدەشتێکی سەوزەڵاندا یاریمان دەکرد و یەکتریمان ڕاودەنا؛ لەناو گیاوگۆڵێکی فێنکدا، لەپاڵ زنارێکی قەوزاویدا ڕاکشابووین و وەک دوو ماری عاشقەوماشقە لەیەکتر ئاڵابووین..

ڤینۆس دەیگوت:

– داپیرەم هەشت مانگێک لەمەوبەر سەری نایەوە، خانوویەکی گەورە و جوانی لەدووای خۆیەوە بۆ من بەجێ هێشتووە. ئەگەر بێی، قەناعەت بە باوکم دێنم، دەچین پێکەوە لەو خانووە دەژین.

– من لە چاوی تۆ زیاتر هیچی دیکەم ناوێ، ڤینۆس. تۆ خۆت ماڵی منی. ئەرێ بەڕاست، من پێش ئەوەی بێم، دەبێ خانووەکەی ئێرەم بفرۆشم!

– خانووەکەت هی خۆتە؟

– ساڵێک نابێ کڕیومە.

– ئنجا بۆ دەیفرۆشی؟

– بۆئەوەی لەوێ خانووی خۆمان هەبێت و کرێی خانوو نەدەین.

– لە خانووەکەی داپیرەگەورەمدا دەژین.

– کەواتە، پارەی ئەم خانووەی پاریسم دەخەینە پرۆژە و کارێکەوە.

– تۆ دەزانی؛ ئێستا باوانم دڵیان چەند خۆش دەبێ، دارا!

– بە چی؟

– بەوەی ئەگەر بزانن «هونەرمەندێک» دێ داوای دەستم دەکا...





– پێیان بڵێ «ئەو پیاوە لەپێناو من پاریس بەجێ دێڵێت و دێ لە گوندەکەی ئێمە دەژی».

– لەوانەیە لە سەرەتادا باوەڕم پێ نەکەن، دەزانی!

– باوەڕ بە چی نەکەن؟

– بەوەی کە پیاوێک لەپێناو من ئەم پاریسە خۆشە بەجێ دەهێڵێ و دێ لە سانتیاگۆ دەژی.

– بڵێ «شێتە».

– نا. ڕاستییەکان پێ دەڵێم. دەڵێم: شەیدای من بووە.

– پێیان بڵێ «ئەو پیاوە، کۆنە جوتیارێکی کوردە، غەریبیی کێڵگە و بێستانەکانی وڵاتی خۆی دەکا».

– نا. دەڵێم: هەر لەبەر من ئیسپانیاشی لەلا شیرین بووە و دێ لە سانتیاگۆ دەژی.

– پێیان بڵێ: «ئەم پیاوە هیچ کەسوکارێکی نەماوە. کەسی نییە خۆشی بوێت و بەخێوی بکا. من لە ڕاهی ئەو خوایە ئیتر دەیگرمە خۆم».

– نا..! ڕاستییەکەیان پێ دەڵێم. دەڵێم: «نیگارکێشێکی دەوڵەمەندە؛ گەلەرییەکانی پاریس خوا خوایانە تابلۆ جوانەکانی لێ بکڕن».

– پێیان بڵێ «لادێییە.. غەریبیی چیا و گوند و ڕەشماڵان دەکا»!

– وایان پێ ناڵێم.

– ئەی دەڵێی چی؟

– دەڵێم «هونەرمەندە، حەز لە سروشت و هێمنی و جوانی دەکا».

– باشە، ئەدی ئەگەر لێتیان پرسی «بۆچی دێتە ئێرە»؟

– پێیان دەڵێم «بۆ من»، «لەبەر من دێ».

– بەڕاست؟

– هەر ڕاست و ڕەوان وایان پێ دەڵێم. دەڵێم «یەکترمان خۆش دەوێ». دەڵێم «دێ بۆئەوەی پێکەوە بژین».

– پێیان خۆش دەبێ!

– زۆر.

– دڵنیای؟

– دەڵێم: ماوەیەکی زۆرە کە یەکتری دەناسین.

– ئینجا خۆ هەر وایشە!

– منیش واهەست دەکەم، دارا گیان.

بە خۆشەویستی و نیگایەکی میهرەبانەوە، سەیری چاویم دەکرد:

– بەڵام پێم بڵێ، ڤینۆس، تۆ ئەو هەموو ماوەیە لەکوێ بووی؟

ڤینۆس، چاوەکانی پڕ باری شەرم، دەتگوت دوو فینجانی پڕ قاوەی سەوزن:

– چاوەڕێم دەکردی.

– لە کوێ؟

– لە سانتیاگۆ.

سانتیاگۆ!

لەناو فارگۆنی شەمەندەفەرەکە دانیشتبووم و ئەم وشە بە دەمی ئەو زۆر شیرینەی «سانتیاگۆ» بە نەغمەیەکی خرۆشێن و دڵگیرەوە لە مێشکمدا دەزرنگایەوە. لەناو ئاسوودەیی خۆمدا دەخنامەوە و لەبەر خۆمەوە پێ دەکەنیم.

## 10

دەنگە دەنگێکی نامۆ لە خەوێکی قووڵ بێداری کردمەوە. کە چاوم کردەوە دیتم خێزانە جوتیارێک بوون. دایک و باوک و کوڕ و کچۆڵەیەک. هەستم بە نامۆیی و سەرسامییەک کرد، تەنانەت کەمێک سڵەماشمەوە.

دایک و باوکەکە لەنێو خۆیاندا بە زمانێک قسەیان دەکرد کە تێیان نەدەگەیشتم. بە چاوی خەواڵووەوە تەماشای پیاوەکەم کرد، لە دڵی خۆمدا گوتم: «لەوانەیە کەتەلان بن». باوکەکە یەکسەر تەماشای کردم و بە زمانی ئیسپانی پێی وتم:

– ئێوارە باش.

منیش هەر بە ئیسپانی وەڵامم دایەوە:

– ئێوارە باش.

پاشان لە باوکەکەم پرسی:

– سەعات چەندە؟

سەیرێکی سەعاتەکەی مەچەکی کرد:

– یەک و دە دەقیقە!

بەلامەوە سەیر بوو! نزیکەی حەوت سەعاتێک دەبوو خەوم لێ کەوتبوو، ترسام، لە دڵی خۆمدا گوتم: «لەوانەیە شەمەندەفەرەکە لە سانتیاگۆش تێپەڕی کردبێ!»، «چ بکەم؟» بەپەلە سەیرێکی پەنجەرەکەم کرد: هەر زنجیرە شاخی سەوز و سەخت و





گەردنکەش بوون، وێڕای قەدپاڵی سەوز و کەپر و ساباتی و دەشتەلانێکی ڕەنگین، لەگەڵ رووبارێکی پێچاوپێچی ئارام کە قەت کۆتایی نەدەهات.. تێپەڕ دەبوون.

باوکەکە زانی کە غەریب و نابەڵەدم، هەستیشی پێ کرد کە بەم وەڵامەی ئەو شڵەژام، یەکسەر پرسی:

– بۆ کوێ دەچی؟

– سانتیاگۆ دی کۆمپۆستێللا.

ئارام بۆوە، وتی:

– جارێ ماویەتی.

پرسیم:

– ئێمە لە کوێین؟

وتی: وێستگەی پێشوو ئۆرێنسە Orense بوو. دووای بیست دەقیقەی تر دەگەینە سانتیاگۆ.

– سوپاس .

ئەمەم وت و چاوم لە سروشتی ڕەنگینی ئەودیو پەنجەرەکە درووی.

ڤینۆس ڕاستی دەکرد! مەڵبەندێکی چەنێک ڕەنگین و دڵڕفێنە!

لە گۆشەی دەستە چەپی پەنجەرەکەوە، بە قەدپاڵی شاخێکی بەرزی سەرکەشەوە، کلکی شەمەندەفەرەکەی خۆمانم دەدیت، لەسەرەخۆ دەسووڕایەوە و بەدووامانەوە دەهات. ئەم دیمەنە زۆر سەرسامی کردم، لەهەمان کاتدا دڵخۆشیش، شاگەشکەبووم، وتم: «تۆ بڵێی چیا سەخت و سەرکەشەکانی کوردستانیش ڕۆژێک دابێ ئاوها شەمەندەفەریان تێ بگەڕێ! ئەم مەڵبەندە شاخاوی و سەرکەش و ڕەنگینە، بەتەواوەتی هەڵەبجە و شاخە سەوز و گەردەنکەشەکانی هەورەمانی بیر دەخستمەوە. لەبەر ئەوەی ساڵانێکی یەکجار زۆریش بوو چاوم بە هیچ چیا و چۆم و ڕەز و پێدەشتێکی هێندە ڕەنگین و سیحراوی نەکەوتبوو، بینینی ئەم سروشتە کێویلە و سازگار و دڵڕفێنە وای لێم دەکرد هەست بکەم لە باوەش وڵاتەکەی خۆمدا بم، لەوەش زیاتر وای لێ دەکردم هەست بە ئارامی و هۆگری و ئۆخژن بکەم. وەک ئەوەی لە خەونێکی خۆش ڕاست بێتەمەوە، زەردەخەنەیەک کەوتە سەر لێوەکانم، بەخۆمم گوت: «تەواو»، «دێم لێرە دەژیم».

گیان ڤینۆس! ئەو شەوە لێم پرسی:

– لە سانتیاگۆ هیچ شوێنێک هەیە وەک ئەوەی مۆنماختی پاریس کە نیگارکێشەکان تێیدا کۆبنەوە و پۆرترێت بۆ خەڵک دروست بکەن؟

وتی: نازانم. هەرگیز شوێنێکی ئاوهام نەدیوە.

ئنجا گوتی:

– پاشان، ژمارەی دانیشتووانی خەڵکەکەی زۆر کەمە؛ بە هەمووی تەنیا هەشت هەزار کەسێکی لێیە.

– بەڕاست؟

– بەڵام گەڕەکی کاتێدراڵەکە لە سانتیاگۆ هەمیشە پڕە لە تووریست، بەتایبەتی هاوینان، بە هەزاران خەڵک لە هەموو ئەورووپاوە ڕووی تێ دەکەن. ئەورووپییەکان بە سانتیاگۆ دەڵێن «قەعدەی ئەورووپا». دەزانی؟

– بۆ؟

– چونکە بارانی زۆر لێ دەبارێ.

من زۆر حەزم دەکرد ڤینۆس باسی گوندەکەی خۆیم بۆ بکا. گوێم شل کردبوو، پاشان وەک ئەوەی بیەوێ سوعبەتێکم لەگەڵ بکا، پێکەنی:

– ئەگەر بێی لەوێ ستاندەکەت لە بەردەم کاتێدراڵەکە هەڵدەیت و پۆرترێت بۆ ئەو هەموو خەڵکەی ئەوێ دروست بکەی، لە ماوەی مانگێکدا، ئیتر بۆ خۆت دەبیتە «ملیۆنێر»!

وتم: هەوڵدەدەم وردە وردە خۆم لەو ئیشە بازرگانییە دوور بخەمەوە.

وتی: دەتوانی بشچیتە «ڤیلا گارسیا» لە قەراغ ئەتڵەنتیک؛ پۆرترێت بۆ خەڵک دروست بکەی.

– ئەتڵەنتیک لەوێوە دوورە؟

– هێندە دوور نییە، بەپێ نیو سەعاتێک لەماڵەکەی ئێمەوە دوورە.

– لەوانەیە هاوینان خەڵک زیاتر بێن بۆ ئەوێ!

– بەهارانیش، هەمیشە پڕە لە تووریست.

ئنجا زەردەخەنەیەک تەواوی ڕوخساری گەشاندەوە:

– وەرە! دەتبەم ئەو شوێنانەت هەموو پیشان دەدەم. پێکەوە دەچینە قەراغ رووبارەکەی شاری «لاکۆرۆنیە»، شوێنێکی هەتا بڵێی دڵڕفێنە. دەچین پێکەوە سەر لە مۆزەخانەکە دەدەین. (باغی فریشتان)، (گەڕەکی مامزان)... هەوارگە و دیمەنی هێندە دڵگیری تێدایە، قەت لە تەماشاکردنیان تێر نابی!

پیاوەکەی بەرامبەرم، تەماشای زەردەخەنەی ئاسوودەی سەر ڕوومی دەکرد. سەرم بەرز کردەوە (هەر بۆ ئەوەی بیدوێنم) لەو پیاوەم پرسی:

– کاتێدراڵی سانتیاگۆ لە وێستگەی شەمەندەفەرەکەوە دوورە؟

– نەخێر. هەرکە لە شەمەندەفەر دادەبەزیت و دەکەویتە سەر شەقامەکە، بەدەستە





چەپا تەنیا دە دەقیقەیەک دەبێ بە پێ.

پاشان، وتی:

– سانتیاگۆ شارێکی بچووکە.

زەردەخەنەیەکی خۆشحاڵیم کرد، وتم:

– بەڵێ.

پیاوەکە پرسی:

– جەنابت کاستیلانیت؟

– نەخێر. تووریستم.

ڕووم لە پەنجەرەکە کردەوە، گوێم لێ بوو پیاوەکە وتی:

– هاتووی سەر لە کاتێدراڵەکە بدەی؟

وتم: نەخێر؛ هەندێ هاوڕێم لێرە هەن. حەز دەکەم بچم سەریان لێ بدەم.

– سێ سبەی (پاپا) دێتە ئەم مەڵبەندە، خوا ڕۆحی بپارێزێ، دێ سەر لە کاتێدراڵەکە دەدا.

ئەم هەواڵە هێندە سەرنجی منی ڕانەکێشا، بەڵام هەر بۆ ئەوەی ڕووخۆشی دەرببڕم، وتم:

– بیستوومە دەڵێن: ئەمە کاتێدراڵێکی هەتا بڵێی قەشەنگ و سەنگینە!

– بەڵێ. ساڵی بە هەزاران خەڵک لە هەموو ئەورووپاوە دێن سەری لێ دەدەن. لە سەدەی دووازدەهەم دروست کراوە.

لەناکاو، لە پەنجەرەی شەمەندەفەرەکەوە، وێستگەی شەمەندەفەری سانتیاگۆم لێ وەدەرکەوت. لە کەیفخۆشییان شاگەشکە بووم. لەسەر شۆستەی هێڵی شەمەندەفەرەکە، بەدەستە چەپ، لەسەر تەختەیەکی گەورەی سپی، بە خەتێکی درشت نووسرابوو:

«Santiago De Compostella».

خەریک بووم لە شەمەندەفەرەکە دادەبەزیم، لەناو دەرگای شەمەندەفەرەکەوە تەماشای سەر شۆستەکەم کرد: خەڵک، بەکۆمەڵ، تاک تاک، جووت جووت، لەسەر شۆستەی هێڵی شەمەندەفەرەکە ڕاوەستابوون. هەر یەکەیان بە چاوەڕوانی و بە پەرۆشییەوە چاویان دەگێڕا. هەر یەکەیان پێشوازییان لە خۆشەویستێکی، لە هاوڕێیەکی، یان لە دایکی، یان لە خوشکی، یان لە باوکی، خۆیان دەکرد. من لەو دەمەدا هەستی غەمگینی و فیگارییەکی قووڵ نیشتە سەر ڕۆحم. من ساڵانێکی یەکجار زۆرە لە هیچ سەفەرێکمدا، لە هیچ گەشتێکمدا، دایکم، باوکم، برام، یان خوشکم؛ هیچ کەسێکم نەهاتوونەتە پێشوازیم! هەستم دەکرد بەدرێژایی تەمەنم، من هەمیشە تەنیا بوویم؛

هەمیشە نامۆ و بێکەس و بێ پێشوازی!

لەسەر شۆستەی شەمەندەفەرەکە، دەمویست بەناو خەڵکەکەدا، بەرەو لای دەرگای چوونە دەرەوە برۆم. لەناکاو کچێکی کۆک، دەفتەرێکی درێژی لەژێر هەنگڵ بوو، لێم نزیک بۆوە، بە پێشوازییەکی گەرمەوە، وتی:

– ببورە، بەڕێزت ڤالێری ڤانسێنیت؟

منیش زەردەخەنەیەک گرتمی:

– بۆچی؟

وتی: رایانسپاردووم کە پێشوازیتان بکەم و بتانگەیەنمە هۆتێلی ( پانسیۆن ).

– بۆچی؟

– لەوێ شوێنیان بۆ گرتووی.

پێکەنیم:

– نەخێر، من ئەو نیم.

کە لە دەرگای چوونە دەرەوە نزیک کەوتمەوە، دیتم دوو پیاو، وەک دوو زۆرانباز، ئەملا و ئەولای دەرگایان گرتبوو. هەر دووکیان بەشێوەیەکی زۆر سەیر تەماشایان دەکردم. منیش کەمێک سڵەمامەوە، جەنتاکەم لەسەر شانم هەڵتەکاند و خۆم لێیان کەرکرد و رۆیشتم. خەریک بووم بەناو دەرگاکە تێپەڕ دەبووم، یەکێکیان وتی:

– شەوی بە ١٧٠٠ پەسێنت، دەڵێی چی؟

منیش گوێم نەدانێ، رۆیشتم. لە دڵی خۆمدا گوتم «دیارە گەوادن».

کە گەیشتمە ناو دالانەکە، دیتم لە دەستە چەپمەوە، دوو پیاوی دیکە، بە هەمان شێوە راوەستابوون. یەکێکیان هەنگاوی نا، ویستی لێم بێتە پێشەوە؛ بەلام ژنێک لەلای دەستە راستەمەوە، کە لە تەنیشت دوو ژنی دیکە راوەستابوو، زووتر دەسپێشخەریی کرد و پێش پیاوەکە گەیشتە لام، بە زەردەخەنەیەکەوە پێشوازیی لێم کرد:

– ئێوارە باش!

منیش تەماشایەکی ژنەکەم کرد، ژنێکی سەر و قژ کەمێک ماش و برنجی، خاوەن روخسارێکی دایکانە، بە هیچ شێوەیەک رێی تێ نەدەچوو ژنێکی خراپ و دەغەڵکار بێ:

– ئێوارە باش!

بەپەلە وتی:

– شەوی بە ١٥٠٠ پەسێنت!





وتم: چی؟

وتی: جەنابت لە باسکەوە هاتووی؟

وتم: نەخێر.

ئەم جارە وایزانی ئیسپانی نازانم، هەر دوو دەستی لەژێر بناگوێی چەپی دانا و هێمای نوستنی بۆ کردم، پاشان هەر بەدەم هێما کردنەوە، بۆی روون کردمەوە:

– یەک شەو بە ١٥٠٠ پەسێنت.

وتم: خانوو؟

وتی: بەڵێ.

وتم: لەکوێ؟

دڵی خۆش داهات کە دیتی ئیسپانی قسە دەکەم، وتی:

– لە گەڕەکی کاتێدراڵەکە.

– بە ١٥٠٠ پەسێنت؟!

وتی: لە سانتیاگۆ خانووت لەوە هەرزانتر دەست ناکەوێ!

وتم: گرانە.

– گرانە؟ ژوورێک لە هوتێلێکی تەنانەت دوو ئەستێرەشدا ئەمڕۆ بە ١٩٠٠ پەسێنت دەست ناکەوێ!

لەو دەمەدا تەماشایەکی ژن و پیاوەکانی دەوروبەی خۆم کرد، راوەستابوون و گوێیان راگرتبوو. ژنەکە درێژەی پێ دا:

– بۆ بەرژەوەندیی خۆت پێت دەڵێم، ژوور لە هوتێلەکان نەماوە. هەموو هوتێلەکان لە دوو رۆژ لەمەوبەرەوە هەموویان حجز کراون.

لەوکاتەدا، یەکێک لەو دوو پیاوەی کە پێشتر لەناو دەرگای هاتنە دەرەوەدا سەیریان دەکردم، لەگەڵ ژن و پیاوێکی رێکپۆش (دیار بوو تووریست بوون ) بە تەنشتماندا تێپەڕ بوون، بەرەو پێپیلکەی شەقامەکە دەرۆیشتن. من لە پیاوە تووریستەکەم پرسی:

– ئەرێ، بمبورە! ئەم هەرایە چییە؟

– چما نازانی؟

– نەخێر.

– پاپا؛ پاپای پیرۆز سەردانی سانتیاگۆ دەکات.

ژنەکە هەر لە غەمی بەکرێدانی خانووەکەیدا بوو:

– دەڵێی چی؟

من بیرم دەکردەوە: توریستێکی زۆر لەبەر سەردانی پاپا هاتوونەتە سانتیاگۆ. هوتێلەکان هەموو گیراون، کرێی خانوو گران بووە.

– نا، زۆر سوپاس.

ڕۆیشتم. بەدەم ڕۆیشتنەوە، لەگەڵ خۆمدا گوتم: «ئەوا ئەگەر ئەمشەو ڤینۆس خۆی لە ماڵەوە نەبێ؟»، «یان ئەگەر سەفەرێکی بۆ لایەک کردبێ!»، «چ بکەم؟». «هەرچۆنێک بێ، باشتر وایە ئەم شەو جارێ بچمە هوتێلێک!».

یەکسەر گەڕامەوە، بەرەو لای ژنەکە چووم. ژنەکە هاتەوە پێشوازیم، وتی:

– ها؟

وتم: من تەنیا بۆ یەک شەومە!

– تەنیا ئەم شەو؟

– بەڵێ.

– باشە. با بڕۆین.

تۆپەڵە کلیلێکی بەدەستەوە بوو، بەپێشم کەوت.

کە کەوتینە ڕێ، لە دوورەوە، بەسەر دیواری ئەملا و ئەولای هەردوو پێپیلکە بەرزە بلۆک چنەکەی بەرامبەرم، ئەفیشێکی ڕەنگینی گەورەم کەوتە بەرچاو، وێنەی پاپای لەسەر بوو، بە خەتێکی درشت لێی نووسرابوو: ( ١٩ و ٢٠ ی مانگی ئووت: سەردانی پیرۆزی پاپا بۆ سانتیاگۆ).

لە ژنەکەم پرسی:

– ئەمڕۆ چەندی مانگە؟

ژنەکە لە پێشەوە دەڕۆیشت، بێ ئەوەی ڕابوەستێ:

– حەڤدەی مانگە.

کە بەسەر پێپیلکەکاندا دەکەوتین، تەماشای بەرپێی خۆم دەکرد و لە دڵی خۆمدا دەمگوت: «ئەوەتا، ئەمە پێپیلکەیەکی بەرزی بلۆک چن»، «ئێستا دەمانخاتە سەر شەقامێک کە چ بە دەستە ڕاستا و چ بە دەستە چەپا هەر دەڕوا و درێژ دەبێتەوە».

پێپیلکەکانمان بڕی، کەوتینە سەر شۆستەی شەقامەکە، ژنەکە ڕاوەستا، وتی:

– بەم شەقامەی دەستە چەپەوە.

وتم: نەء، تکایە!

وتی: چی؟

وتم: ئەگەر قبووڵ بکەن، من پارەی کرێی ئەم شەوتان هەر لە ئێستاوە دەدەمێ.





ئێستا دەچمە لای هەڤاڵێکم و دووای سەعاتێک یان دوو سەعاتی تر دەگەڕێمەوە.

وتی: ئارەزووی خۆتە.

– کلیلی ماڵەکەم بدەرێ، لەگەڵ ناونیشانەکەی؛ خۆم دێم دەیدۆزمەوە.

– ئێمە لە هەمان ئاپارتمانەکەی تۆدا دەژین.

– باشتر.

– ژوورەکەی تۆ لە نهۆمی سێیەمە. هەمان نهۆمی ماڵەکەی ئێمە.

– زۆر باشە.

دەستم بۆ باخەڵم درێژکرد، ١٥٠٠ پەسێتتم دایە. ئەویش کارتێکی بچکۆڵەی سپیی دامێ:

– ئەمە ئادرێسی ماڵەکەمانە، لە گەڕەکی کاتێدراڵەکە. ئەمەش کلیلی ژوورەکەتان لە نهۆمی سێیەم، ژمارە (٣).

– نهۆمی سێیەم، ژمارە (٣).

– سوپاس.

دەستی بۆ کارتە بچکۆڵە سپییەکەی دەستم درێژکرد:

– ناوی خاوەنماڵەکە لەسەر ئادرێسەکەدا نووسراوە: (مەدام کارلۆس).

– مەدام کارلۆس ناوی بەڕێزتانە؟

– ئەدی ناوی جەنابت؟

– دارا.

– چ کار دەکەن؟

– نیگارکێشم.

– ئاه، زۆر باشە! ئەمە یەکەمجارە نیگارکێشێک ژوورمان لێ بەکرێ بگرێ. دیمانەت بەخێر.

– سوپاس، لوتفتان هەیە.

– چاوەڕێتین.

ژنەکە ڕۆیشت. من سەیرێکی ئەملاو ئەولای شەقامە درێژە، بە دوو لا کشاوەکەی دەستە ڕاست و دەستە چەپی خۆمم کرد، ڕووم کردەوە بەرامبەری خۆم: «شەقامێکی باریک و بچکۆلانەی هەوراز»، دەقاودەق، خۆیەتی! بەتەواوەتی بەپێی وەسفکردنەکەی ڤینۆس دەڕۆیشتم. یەکسەر پەڕیمەوە، شەقامە باریک و هەورازەکەی بەرامبەر خۆمم گرتەبەر، سەرکەوتم. هەر سەرکەوتم. جانتایەک بەشانەوە، جانتایەکی دیکەش

بەدەستمەوە، هەستم بە کەمێک تەنگەنەفەسی دەکرد.

هێندەی پێ نەچوو، هەورازی شەقامەکە بۆوە ڕاستە ڕێ. ڤینۆس دەیگوت:

– کە شەقامە هەورازەکە دەبێتەوە ڕاستەڕێ، نزیکەی سەد مەترێکی دیکەش هەر ڕاستەوڕاست دەڕۆی، ئیدی لەو ناوە، بەدەستە ڕاست، لووتکەی کەنیسەیەکت لێ وەدیار دەکەوێ: کەنیسەی سانت ژاک!

ئاوڕێکم بە لای دەستەڕاستی خۆم دایەوە و بەرز ڕووانیم، دیتم بەڕاستی: لووتکەی کەنیسەیەک، بە نەخش و نیگاری ڕازاوەی جوانی شێوازی گووتیک، لێم وەدیار کەوت. «ئەمە کەنیسەکەیە، کە باسی دەکرد: کەنیسەی سانت ژاک».

لە خۆشییان پێم زەویی نەدەگرت. هەنگاوم بەرزتر هەڵنا. لە دڵی خۆمدا دەمگوت: «خوای گەورە، ئێستا کە دەگەمە بەردەم ماڵەکەیان و لە دەرگا دەدەم؛ کاتێ ڤینۆس دێت و دەرگام لێ دەکاتەوە، دەبێ هەست بە چی بکا!». «لەوانەیە لە سەرەتادا باوەڕ بە چاوی خۆی نەکا!»؛ «بەڵام نا، دەزانێ!»، «لە پاریسەوە، پێش چەند ڕۆژ؟ پێش حەوت ڕۆژ، نامەم بۆی نارد، بۆم نووسیبوو: لە دەوروبەری ۱۸ و ۱۹ی مانگ دێمە لات، چاوەڕێم بە! ئێستا نامەکەمی پێ گەیشتووە، دەزانێ. دەزانێ کە دێم دەیبینم. ئێستا چاوەڕێم دەکا. ناشێ سەفەری بۆ هیچ لایەک کردبێ! تۆ بڵێی! ئەوەتا ئەمە کۆڵانی کەنیسەکەیە! ڤینۆس دەیگوت:

– پێچ ناکەیتەوە، تا دەگەیتە کۆڵانی کەنیسەکە!

ئەوەتا، با بیرەوە پێچ بکەمەوە. ئیتر ئەمە کۆڵانی کەنیسەکەیە. خۆیەتی.

لە ئەورووپا، ئەمەی خۆشە کە ناونیشان زۆر بە ئاسانی دەدۆزرێتەوە: فلان شار، فلان گەڕەک، فلان کۆڵان، فلان کۆد، فلان ڕێگا، فلان ژمارەی خانوو، ئیدی تەواو دەگەیتە جێ.

ئیتر لەم کۆڵانەوە، پێویستە بەدووای ڕێگای خانوەکەیاندا بگەڕێم. پێویست ناکا لە کەس بپرسم. ئاشکرایە: شەقامی پەرەدیس paradis، خانووی ژمارە (۹).

کۆڵانەکە: چۆڵ. خامۆش، لەملا و لەولاوە، درەخت سێبەریان بەسەردا کردبوو. بۆنێکی خۆش لە کۆڵانەکە دەهات، لە بۆنی مووڕتک و هەڵاڵان دەچوو. هێور هێور هەنگاوم هەڵدەنا، زۆر بە وردبینیەوە تەماشای تابلۆی یەکەیەکەی ناوی شەقامەکانم دەکرد و دەمخوێندەوە. چاوەڕێم دەکرد هەرکە ناوی (شەقامی پەرەدیس )م بکەوتایەتە بەرچاو، یەکسەر خۆمی پێدا بکەم و خانووی ژمارە (۹) بدۆزمەوە.

سەرتاسەری ڕێگاوبان و شەقامەکانی کۆڵانەکە گەڕام، ناوی (شەقامی پەرەدیس )م نەکەوتە بەرچاو! ناچاربووم کە دیسان، لەوسەری کۆڵانەکەوە بە هەمان کۆڵاندا بگەڕێمەوە و سەرلەنوێ، ئەمجارەیان زۆر وردبینانەتر، چاو بە تابلۆی ناوی ڕێگاکاندا بخشێنمەوە.





کاتێ گەیشتمە بەردەم کەنیسەکە، کوڕێکی گەنج بە بەردەم کەنیسەکەدا ڕەت دەبوو، ڕامگرت، وتم:

– ئەرێ زەحمەت نەبێ، ببوورە! شەقامی (پەرەدیس ) پێ نازانی؟

– شەقامی «چی» ؟

– شەقامی پەرەدیس؟

پێکەنی، وتی:

– من تەنیا شەقامی (ئەنفێرنۆ ) پێ دەزانم.. ئەوەتا لەم تەنیشتەوە، یەکەم کۆڵان، بەدەستە ڕاست!

لە دڵی خۆمدا وتم: «ماقووڵ نییە! چۆن!»

بەردەم کەنیسەکەم جێ هێشت، کەوتمەوە ڕێگا. هەر چاوم دەگێڕا و دەگەڕام، هیچ ڕێگایەکم بە ناوی شەقامی پەرەدیس نەدۆزییەوە.

لەسەری کۆڵانەکە چاش مابووم. بە سەرسامییەوە تەماشای پیاوێکی پیرم دەکرد کە خەریک بوو لە ماڵەکەیان دەردەهات، لێی نزیک کەوتمەوە، لێم پرسی:

– ببوورە، خاڵە، شەقامی پەرەدیس پێ نازانی؟

تەماشایەکی جانتاکانی کۆڵمی کرد:

– نازانم!

پاشان وتی:

– دڵنیای لەم گەڕەکەیە؟

– بەڵێ، دڵنیام.

– پێیان نەوتی لە نزیک کوێیە؟

– وتیان لە کۆڵانی کەنیسەکەیە، تەنیشت کەنیسەی سانت ژاک.

– ئێ ئەمە کەنیسەی سانت ژاکە!

– بەڵێ.

– بەڵام هیچ شەقامێک بەم ناوە لێرە نییە.

– سەیرە!

– منیش پێم سەیرە!

– من حەوت ساڵە لەم کۆڵانە دەژیم، هیچ شەقامێکم بەم ناوە، تەنانەت لە هەموو گەڕەکەکەشماندا، نەبیستووە!

دەمویست بڕۆم، پیاوەکە وتی:

- بەڵام تەنیشت کەنیسەکە، شەقامێکی لێیە بە ناوی شەقامی ئەنفێرنۆ.

پاشان پێکەنی، وتی:

- نازانم!

پیاوەکە ڕۆیی، پێم وت «سوپاس».

بەپەلە بەرەو لای کەنیسەکە گەڕامەوە، لە دڵی خۆمدا دەمگوت: «سەیرە!»، «شەقامی تەنیشت کەنیسەکەیە!» «باشە»، «ئێ ئەوەتا، ئەمە شەقامی تەنیشت کەنیسەکەیە! بەڵام ناوەکەی، شەقامی پەرەدیس نییە»، «ناوێکی ترە: شەقامی ئەنفێرنۆ».

یەکسەر پێچم کردەوە، ملم نایە شەقامی تەنیشت کەنیسەکە (شەقامی ئەنفێرنۆ)، وتم «ئەگەر لەم ڕێگایەدا خانووی ژمارە ٩ خانوویەکی سپیی بەرز بێت و دەرگایەکی سەوزی دوودەریی هەبێت و وێنەی تاووسێکی بەسەرەوە بێت، ئەوا مانای وایە خۆیەتی و من ناوی ڕێگاکەم بەهەڵە نووسیوە!».

بەکونجکۆڵییەوە چاوم بە ژمارەی خانووەکاندا دەگێڕا. لەناکاو، لە ڕیزی خانووەکانی دەستەچەپەوە، چاوم بە خانوویەکی گەورەی دوونهۆمیی بەرزی سپی کەوت. خەنی بووم. وتم «ئەوەتا، خۆیەتی!». دەرگایەکی سەوزی دوودەریی هەبوو، وێنەی تاووسێکی لەسەر نەخشێنرابوو. «تەواو، ئەم خانووە خۆیەتی!»

ژمارەی خانووەکەم خوێندەوە: ژمارە (٩). «کەواتە هەبێ و نەبێ من ناوی ڕێگاکەم لای خۆم بە هەڵە نووسیبوو». «ئا وایە؛ بەڵام بۆچی؟ هەبێ و نەبێ، ئەو شەوەی کە ڤینۆس ناونیشانەکەمی دایە، سەرخۆش بووم: من واتای پەرەدیس و ئەنفێرنۆم لەلا تێکەڵ بووە».

ئەوەتا، ئەم خانووە خۆیەتی: «خانوویەکی سپیی بەرز، دەرگایەکی سەوزی دوودەری، ژمارە (٩). وێنەی تاووسێکی لەسەرە».

گورج لە بەردەرگاکە ڕاوەستام و پەنجەم نایە سەر زەنگی دەرگاکە. گوێم لێ بوو، دەم ودەست، زەنگی دەرگاکە لە ژوورەوە، لەناو ساڵۆنەکەدا دەنگی دایەوە .

کەمێک کشامەوە، لە بەردەم ماڵەکەیاندا تەماشای نهۆمی سەرەوەی خانووەکەیان و پەنجەرە کوژاوە بەرزەکانیانم دەکرد، کە بە پەردەیەکی مەخمەڵیی ئەستوور، تاریک، دادرابوونەوە. چلوپۆپی درەختێکی سەرکەش، لەودیو دیواری ماڵەکەیانەوە (دیار بوو باخچەیەک بوو ) بەسەر شان وملی پەنجەرەکانەوە دەشنایەوە.

چووم دیسانەوە، پەنجەم نا بەزەنگی دەرگاکە. وەک ئەوەی لە چۆڵەوانییەکدا زەنگ بداتەوە، زەنگی دایەوە.

ماوەیەکی زۆر لە بەردەرگا چاوەڕێم کرد، کەس نەهات دەرگام لێ بکاتەوە. لەناکاو





ئاوڕم بە لای دەستە ڕاستی خۆم دایەوە، لە هەمان ڕیزە خانووەکەی ئەواندا دیتم ژنێک، لە دوورەوە، سەری لە دەرگای خانووەکەی خۆیانەوە دەرهێنابوو، بە حەپەساوی و کونجکۆلییەوە تەماشای دەکردم. کە چاوی بە من کەوت؛ بەپەلە، وەک ئەوەی بترسێ، سەری کشاندەوە ژوورەوە، دەرگاکەی داخست.

من لە بەردەم دەرگاکە، هەر ڕاوەستابووم، بیرم دەکردەوە. پێم جوان نەبوو کە بۆ جاری سێهەم بچم لە زەنگی دەرگاکە بدەمەوە. وتم: «دیارە لەوێ نین!»، «تۆ بڵێی سەفەریان کردبێت!».

کۆڵانەکە خامۆش، بەم ئێوارە درەنگ وەختە، جگە لە لەرینەوەی گەڵا و چڵوپۆپی درەختەکان، دەنگی هیچ شتێکی دیکە نەدەهات. هەستم بە کەمێک غەمگینی دەکرد. «نا»، «لەوانەیە چووبێتنە میوانی».

پشتم کردە دەرگاکە. بە خۆمم گوت: «سبەینێ دێمەوە». جانتایەک بە کۆڵەوە، جانتایەکیش بەدەستمەوە، تەماشای بەرپێی خۆمم دەکرد و بە غەمگینییەوە بە خۆمم گوت: «باش بوو ئەو ژوورەم لە گەڕەکی کاتێدراڵەکە بەکرێ گرت».

لە پێش دەرگاکە، پێش ئەوەی ماڵی ڤینۆس بەجێ بهێڵم؛ کاتێ سەرم بەرز کردەوە، دیتم: پیرەژنێک، لە نهۆمی سەرەوەی ماڵێکی دەستە چەپمەوە، لە پەنجەرەوە، پەردەی لادابوو، بە دزە نیگاوە، بەکونجکۆڵییەوە، دیاربوو ماوەیەکی زۆر بوو تەماشامی دەکرد. کاتێ بینیمی من تەماشای دەکەم، یەکسەر بە پەلە پەردەکەی دادایەوە. بە خۆمم گوت: سەیرە! ئەم خەڵکە بۆچی وا تەماشام دەکەن؟»

## 11

ئەو ژوورەی بەکرێم گرتبوو: لە چینی سێهەمی ئاپارتمانەکەدا، ژوورێکی گەورەی ڕێک و پێک، ڕازاوە، قەرەوێڵەیەکی دوو نەفەری، کانتۆرێکی گەورەی جل و بەرگ، مێزێکی بازنەیی بریقاوە کە لە تەختەی دارگوێز دروستکرابوو، دوو پەنجەرەی بچووکی پەردە ئاوریشمینی شین لەملاو لەولاوە کە یەکێکیان دەیڕوانییە سەر شەقامێک، ئەوی تریشیان دەیڕوانیە ناو باخچەیەکی گشتی.

دیار بوو ژنێکی خانەدان و میوانپەروەر و پاک و تەمیز سەرپەرشتیی ئەم خانووە دەکا. وا پێدەچوو مادام کارلۆس هەر خۆی، ڕۆژانە، ئەم ژوورەی من و ژوورەکانی دیکەی ئاپارتمانەکەش پاک بکاتەوە.

لە یەکتربینینەوەی دوێنێ ئێوارەدا، مەدام کارلۆس پێی گوتم:

- من بە ئەسڵ پۆرتوگاڵیم.

کە وای گوت، من یەکسەر ژنە دەرگەوانەکانی پاریسم بیرکەوتەوە: ئەوانەی لە

پۆرتووگـالەوە دەهاتنە پاریس و بەدووای کـاردا دەگـەڕێن. زۆر سـەیرە، زۆربەی ژنە دەرگەوان و خزمـەتکاری ئاپارتمانەکـانی پاریس بە ئەسڵ پۆرتوگـالێن! لە دڵی خـۆمدا گوتم: «جیاوازیی مەدام کارلۆس لەگەڵ ژنە دەرگەوانە پۆرتوگالییەکانی پاریس ئەوەیە کە ئەم خۆی خاوەنی ئاپارتمانەکەیە». لێم پرسی:

– چەند ساڵە هاتوونەتە سانتیاگۆ؟

– من بـاوکی خـۆم نەدیوە، لە سـاڵی **١٩٣٩** لە جـەنگی ناوخـۆی ئیـسـپـانیـا شەهیدکراوە.

– دوو مـانگ دووای شەهیدبوونی باوکم، دایکم ناچاربووە بۆ کار بێتە ئێرە. ئیتر من لێرە لەدایک بوویمە و ئێستـا خۆم بە ئیسـپـانی دەزانم. ئەی تۆ، چۆنە تا ئێستـا ڕەگەزنامەی فەرەنسیت وەرنەگرتووە؛ هێندە ساڵەشە لە فەرەنسا دەژیت.

– من ڕەگەزنامەی فەرەنسیم وەرگرتووە؛ بەڵام خۆم هەر بە کورد دەزانم.

مـەدام کـارلۆس ژنێکی لاواز، قـژ مـاش و برنجی؛ بسکە سوورە پانەکـانی، لەملاو لەولای لاجانگییەوە شۆڕ ببوونەوە. پاشماوەی ناخۆشی و ماندووبوونێکی زۆری ژیان بەسەر ئادگار و دەستەکانیەوە دیاربوو، گوتی:

– کـوڕم، بە ڕای مـن: ئینسـان لە هەر جـێگەیەک لوقـمـەنانێکی دەست بکەوێت، خەڵکی ئەوێیە.

من کە دەمویست ڕێزی ئەم ژنە و بۆچوونەکەی بگرم، گوتم:

– بەڵێ.

– ئەمە یەکەم جارە دێیتە سانتیاگۆ؟

– بەڵێ.

– تۆ مەسیحیت؟ مەبەستم لەپێناو سەردانەکەی پاپا هاتوویتەتە ئێرە؟

– ڕاستییەکەی؛ نەخێر. هەر نەشمدەزانی کە پاپا لەم ڕۆژانەدا سەردانی ئێرە دەکا. من هاتووم سەر لە هاوەڵێکی خۆشەویستی خۆم بدەم؛ لێرە دەژیت.

مەدام کارلۆس، ئەو ئێوارەیە، وەک نەریتی هەر ئەورووپییەکی دیکە، لێی نەپرسیم: ئەو هاوەڵەت کێیە؟ خەڵکی کوێیە، لەکوێ دەژی، چ کارەیە؟

ڕاستییەکەی، من حەزم دەکرد لێم بپرسێت؛ بەڵکو منیش بتوانیایە ئاسانتر و زووتر ڤینۆس ببینمەوە. مەدام کارلۆس تەنیا ئەمەندەی وت:

– خێری پێوەیە.

منیش پێم جوان نەبوو هیچی لێ بپرسم، گوتم:

– دەچمە دەرەوە، بەڵکو ئەو هاوەڵەم دەدۆزمەوە.





بەیانی کە لە خەو هەڵسام کـاتژمێر نۆ بوو. یەکسـەر بەپەلە قـاوەڵتـیەکم کـرد و قـاوەیەکم خـواردەوە. دەرگـاکەم کلیل دا، بە ئاسـانسـۆر دابەزیمە خـوارەوە، چوومە لای مەدام کارلۆس، بە حورمەتەوە ڕۆژ باشم لێی کرد و پێم وت:

– مەدام، لەوانەیە ئەمشەویش هەر لێرە بمێنمەوە. جارێ نازانم!

لەناو دەرگاکەوە وەڵامی دامەوە:

– هاوەڵەکەی خۆتت دۆزییەوە؟

– نەخێر. ئێستا وا دەمەوێ بچم بۆ لای.

– هەرچۆنێک بێ، پێویستە پێش کاتژمێر دووی پاش نیوەڕۆ پێم بڵێی...

– زۆر باشە.

– ئاخۆ ئەمشەویش دەمێنیتەوە یان نا؟

لێم پرسی: ئەگەر نیوەڕۆ نەمتوانی بێمەوە، دەتوانم تەلەفۆنتان بۆ بکەم؟

– بەڵێ، بەڵام پێش کاتژمێر دوو.

– زۆر باشە! تەلەفۆنەکەتان لەلامە.

بە قسەکردنێکی هەندێک منەتبار و نارازییەوە، وتی:

– چونکە خەڵکی تر دێن، داوای ژوورەکە دەکەن.

مـەدام کـارلۆس هەقـیـشی بوو. دوێنێ شـەو، لەسـەر شـەقـامـەکـاندا دەمـبـینی: سەرتاسەری شار خۆی بۆ پێشوازیکردنی سەردانەکەی پاپا ئامادە کردبوو، دەیان لافیتە و ئەفیشی ڕەنگینی جۆراوجۆر لەسەریان نووسرابوو (بەخێرهاتنی سەردانە پیرۆزەکەی پاپا دەکەین)، (سەردانی پاپا شارەکەمان پیرۆز دەکا)، (بەخێر بێن بۆ سانتیاگۆ دی کۆمپۆستێللا). هەر بابا بوو خەڵکی توورێست؛ گەنج، پیر.. تاک تاک، دەستەدەستە، جانتـا لەسـەر شـان، ژن تێـیـان وەردەهاتن و مـامـەڵەی کـرێی خانوویان لەگـەڵ دەکـردن، پاشـانیش وەپێـشـیـان دەکـەوتن بـۆ ئەوەی بۆ شـەوێک یا دوو شـەو یا چەند شـەوێک خـانووکـانیـان بەکـرێ بدەنێ. دیار بوو توورێسـتێکی زۆر، لەبەر ئەو سـەردانەی پاپا، ڕژابوونە ناو شارەکە. سبەینێ، کە نۆزدەی مـانگ بوو، پاپا دەگـەیشـتە سـانتیـاگۆ؛ لە بەردەم کاتێدراڵەکە وتاری بۆ خەڵک دەخوێندەوە.

مەدام کارلۆس هێشتا دەرگای دانەخستبوو، پرسی:

– پێم بڵێ؛ هیچ خانووی دیکەت دۆزیوەتەوە؟

ئاوڕم دایەوە، وتم:

– نەخێر.

– ئەدی بۆچی دوودڵیت لە مانەوەت؟

– راستییەکەی؛ ئەگەر ئەو هاوەڵەی خۆم بدۆزمەوە، لەوانەیە بچم بۆ لای ئەو.

مەدام کارلۆس دەرگاکەی داخست:

– باشە کەواتە تا کاتژمێر دوو چاوەڕێتین.

کە کەوتمە سەرشەقامەکە: هەستم کرد شەقامەکە لەچاو دوێنێ یەکجار زۆر قەرەباڵغترە! هەستم بەوە نەدەکرد لە گوندێک یا لە شارۆچکەیەکی بچکۆڵەدام: شەقامەکە بە هاتوچۆی خەڵک و ئۆتومبێل زرمەی دەهات. ئەوەم بیر کەوتەوە کە دوێنێ، لە ساتی گەیشتنم بۆ وێستگەی شەمەندەفەر، لە بەردەم وێستگەکە پێیان گوتم: «لەبەر خاتری ئەو سەردانەی پاپا، خەڵک لە هەر چوار قوڕنەی ئەورووپاوە دەڕژێنە سانتیاگۆ». قەیرێک لە شوێنی خۆمدا وەستام. چۆن بتوانم ڤینۆس ببینمەوە؟ دەمزانی گەڕەکەکەی ماڵی ڤینۆس دەکەوتە بەرامبەرمەوە. ئیتر یەکسەر بەرەو لای کەنیسەکەی سانت ژاک کەوتمەڕێ.

لەسەر ڕێگای ماڵی ڤینۆس، کە خەریک بووم لە کۆڵانێک پێچ بکەمەوە، لەناکاو کابینەیەکی تەلەفۆنم بەرچاو کەوت. لە دڵی خۆمدا گوتم: «ئەگەر تەلەفۆنیان هەبووایە، ئێستا تەلەفۆنێکم بۆی دەکرد».

من وێنەی لەیلانی کۆنە دەزگیرانم لە ئەودا دیت، تەنانەت وێنەی دایکم، خوشکەکانم، وێنەی هەموو کەسێک و هەموو خۆشەویستێکی لەدەستم چووبوون. واتێ دەگەیشتم کە ڤینۆس وڵاتمە. پێم گوت:

– ڤینۆس، تۆ شێوەی سەیرکردن و نیگات لە نیگای ئەورووپییان ناچێ.

وتی: چۆن؟

– نیگای تۆ گەرمە، پەرۆشیی تێدایە؛ بانگت دەکا.

پێکەنی، گوتی:

– دارا گیان، کێ ناڵێ منیش بە بنەچە ناگەڕێمەوە سەر گیایەک لە کوردستان!

ئەو نیوەڕۆیە لە پاریس پێکەوە چووینە پیاسە، بەرەو پێدەشت و سەوزەڵانە فێنکەکانی قەراغی پاریس. لەناو گەنمەڵانێک، لەژێر دەرەختێکدا، سفرەیەک و نیوە فەرشێکمان ڕاخست و بەیەکەوە نیوە ڕووت پاڵ کەوتین. تاو تاو کە برسیمان دەبوو، هەڵدەستاینەوە سەندەویچێکی چکۆلانەی پەنیری کۆمێمبێرت و تەماتە و خەیارمان دەخوارد. بەجووتە ڕادەکشاینەوە، خۆمان دەدایە بەر هەتاو. هەڵدەستاینەوە دەچووین لە قەراغ شینکاوەکەدا ڕادەکشاین، لە ڕووتیی لەشی یەکتر و ڕووتیی ڕووبار و شەپۆڵەکانی ورد دەبووینەوە.

شەویش بە پاسکیل چووینە مەڵبەندە سەوزەڵانەکەی نزیک فرۆکەخانەکەی شارڵ دووگۆل، لەوێ لەسەر شۆستەیەک، لەناو گیا و گۆڵێکی پاراودا، بەدەم بیرە خواردنەوە،





ڤینۆس گۆرانییە ئیسپانییە میللییەکانی سانتیاگۆی بۆم دەچڕی. کە ماندووش دەبووین، هەر لەناو گیا و گوڵەکەدا لەسەر پشت ڕادەکشاین، تەماشای فرۆکە بەرزەکانی ئاسمانمان دەکرد کە لەتوێی تاریکییەکەوە، وەک ئەستێرەی گەورەی درەوشاوە، لە فرۆکەخانەکەوە هەڵدەستان و بەسەر سەرماندا تێپەڕ دەبوون.

ڤینۆس!

ئێستا لەوانەیە لە ماڵەوە بەتەنیا بێت. بەڵێ، بەیانییە و بەتەنیایە. ئێستا دووشێکی گەرمی وەرگرتووە و خۆی لە ڕۆبێکی پەمبەی نەرم پێچاوەتەوە و دانیشتووە؛ سەروقژی بە ڕەفتەیەکی تەنک بەستووە و چاوەڕێ دەکا، چاوەڕێی زرنگەی دەرگایە: بۆ ئەوەی بە پەلە بێت دەرگاکەم لێ بکاتەوە. کە دەرگاشم لێ دەکاتەوە و چاوی پێم دەکەوێ، یەکسەر، شاگەشکە، بەدەم زەردەخەنەیەکی پڕ لە کەیفخۆشییەوە، هەر لەناو دەرگا باوەشم بۆ دەکاتەوە و دەپرووشێنێ:

– هاتی!

منیش ئیتر، پێی دەڵێم:

– بەڵێنم پێ دابووی.

– کەی گەیشتی؟

– لە دوێنێوە گەیشتووم، بەڵام لەبەرئەوەی تەلەفۆنتان نەبوو، نەمتوانی لە گەیشتنی خۆم ئاگادارت بکەمەوە.

– بەئاسانی ئێرەت دۆزییەوە؟

– کاتێ گەیشتمە وێستگەی شەمەندەفەر، یەکسەر سەرکەوتم بەرەو گەڕەکەکەتان و هاتم بۆ ماڵەکەتان. چەندی لە زەنگی دەرگاکەم دا، کەس دەرگای لێ نەکردمەوە.

– ئەدی شەو، لەکوێ خەوتی؟

– ژوورێکم لە ناوەڕاستی شار، لە نزیک کاتێدراڵەکە بەکرێ گرتووە، لەوێ خەوتم.

دووای ئەم گفتوگۆ بەپەلە و کورتە، لەگەڵ ڤینۆس لەوانەیە یەکسەر پێکەوە هەڵبستین و بە پیاسە بڕۆین بەرەو ئاپارتمانەکەی مەدام کارلۆس؛ هەموو جانتا و کەلوپەلەکانم لە ژوورەکەم هەڵبگرین و بگەڕێینەوە ماڵەکەی ئەوان؛ نانی نیوەڕۆش لە ماڵی ئەوان پێکەوە بخۆین و ئنجا پاشان، پاش نیوەڕۆ، پێکەوە بچین پیاسەیەکی دەرەوە بکەین و ئیتر یەکسەر دەست بکەینە قسە.

کە گەیشتمە بەردەم کەنیسەکەی سانت ژاک ئێستێکم کرد و تەماشایەکی کۆڵانەکەم کرد. پیاوێک کە بەتەنیشتمدا تێپەڕ دەبوو، لە کونجکۆڵێی خۆمدا دەمویست بەتەواوەتی لە ناوی کەنیسەکە دڵنیا ببم بۆئەوەی سەرچیغ نەچم، لەو پیاوەم پرسی:

– زەحمەت نەبێ، ئەمەیە کەنیسەی سانت ژاک؟

– بەلّێ.

– باشە، زەحمەت نەبێ، شەقامی پەرەدیس لەم ناوە نییە؟

پیاوەکە ئێستێکی کرد، پاشان وتی:

– بەداخەوە، پێ نازانم.

من ویستم باش جەختی لەسەر ناوەکە بکەمەوە:

– شەقامی پەرەدیس.

پیاوەکە هەر وەستابوو، تەماشای منی دەکرد و بیری لە «شەقامی پەرەدیس» دەکردەوە:

– سەیرە!

پیاوەکە ڕاوەستا بوو، هەر بیری دەکردەوە. وتم:

– چی؟

– من زۆر جاران ناوی ئەو شەقامەم لێ دەپرسن. چەند مانگێک پێش ئێستا پیاوێکی عەرەبیش، ئەگەر باش بەبیرم مابێ دەیگوت مۆسیقاژەنم؛ ناوی هەمان شەقامی لێ پرسیم.

–.. نییە؟

– نەخێر. من پێنج ساڵە لەم گەڕەکە دەژیم. هیچ شەقامێک بەم ناوە پێ نازانم.

لەو دەمەدا من بیرم لەو قسەیەی پێشووی کابرا کردەوە، پێم وت:

– زۆر کەس ناوی ئەو شەقامەت لێ دەپرسن؟

وتی: بەلّێ. تەنانەت جارێکیان شێتێکیش لێمی پرسی.

من لە ئاست وەڵامەکانی ئەو پیاوە واقم وڕما بوو. تەماشایەکی کردم؛ دیار بوو کەمێک تەریق ببۆوە:

– داوای لێبوردنت لێ دەکەم.

ڕۆیشت.

ئیتر منیش دیسان ڕووم کردەوە هەمان خانووەکەی دوێنێ: خانووی ژمارە (٩ ). لە دلّی خۆمدا وتم: «تەواو. پێی ناوێ، ئێستا هەموو شتێک ساغ دەبێتەوە».

بەدەم ڕێگاوە تەماشای دەوروبەری خۆمم دەکرد: کۆڵانێکی چۆڵ و خامۆش، تەنیا یەک دوو منداڵ لە دوورەوە، لەوسەری کۆڵانەکەدا گەمەیان دەکرد. گەیشتمە بەردەم خانووی ژمارە (٩ ).

توند پەنجەم بە زەنگی دەرگاکەوە نا. گوێم لێ بوو دیسان زەنگەکە لەودیو





دەرگاکەوە، وەک ئەوەی لە حەوشەیەکی چۆڵ و هۆڵدا بزرینگێتەوە، زرنگایەوە. لە بەردەرگاکە، بە لای دەستە ڕاستەوە، ئاوڕێکم دایەوە ناو کۆڵانەکە، دیتم: دیسان، پیرەژنێک، لەو سەری کۆڵانەکەدا، سەری خۆی لە دەرگایەک هێنا دەرەوە و بە کونجکۆڵیەوە تەماشایەکی منی کرد کە لەپێش دەرگاکەی مالّی ڤینۆس ڕاوەستابووم، هەمان پیرەژنەکەی دوێنێ ئێوارە بوو. گوێم نەدایە ئەو پیرەژنە، سەرلەنوێ لە زەنگی دەرگاکەم دایەوە.

هێندەی پێ نەچوو لە بەردەم دەرگاکە گوێم لە جووڵەیەک بوو کە لەودیو دەرگاکەوە هات. وتم «ئۆخەی». پاشان خشەخشی سۆلێکم کەوتە بەرگوێ، لە قووڵایی حەوشەکەوە، لە دوورەوە دەهات. بە نا ئارامی و لە هەمان کاتدا بە دڵخۆشییەوە گوێم لە دەنگی خشەخشی سۆلەکە ڕاگرتبوو: زۆر بێ هێز، زۆر خامۆش، زۆر ماندوو دیار بوو، لە دەنگی هەنگاونانی مردوویەک دەچوو. لەناکاو، دەنگی خشەخشی سۆلەکە لەپشت دەرگاکە ڕاوەستا، دەنگی نەما. پاشان دیتم دەرگاکە، بەئاستەم، درزێکی تێ کەوت. ئینجا وردە وردە، بە جیڕە جیڕ، وەک ئەوەی ساڵانێکی یەکجار زۆر بێ نەکرابێتەوە، کرایەوە.

من هەر ڕاوەستابووم و چاوەڕێ بووم. دەرگاکە وردە وردە بەتەواوەتی کرایەوە، بەڵام هیچ کەسێک لەناو دەرگاکە وەدیار نەکەوت. ترسام. ویستم بکشێمەوە. پاشان دیتم لەناکاو «دەستێکی چرچی ڕەشهەڵگەڕاو» کەوتە سەر قەراغی دەرگاکە. وردە وردە دەرگاکەی کردەوە. خەریک بوو تارماییەک لەودیو دەرگاکەوە وەدیار دەکەوت. دیتم «پیرەژنێک» بوو.

پیرەژنەکە ڕەفتەیەکی مۆری ئەستووری لە سەروپۆتەڵاکی خۆی بەستبوو. کاژەڵاک سپی. لەملا و لەولای لاجانگییەوە دوو بسکی سووری درێژی بەردابۆوە. دیاربوو دان لە دەمی نەمابوو. سەرتاپای جلوبەرگ ڕەشپۆش، پەڵەی پیسی ڕشانەوە و شۆربا بەسەر دامێنییەوە بوو. دەست بە گۆچانێکی خواری گرێ گرێ، لەناو دەرگا ڕاوەستابوو.

کاتێ ئادگار و ڕوخساری پیرەژنەکەم چاو پێ کەوت، یەکسەر هەستێکی تەلّزماویی ئالّۆز لە ناخمدا بلاّچەی سەند. هەستم دەکرد ئەو پیرەژنەم چەند سالّێک پێش ئێستا، یان پێش ماوەیەک لە شوێنێکی دیکەدا، یا «لە خەونێکمدا» دیوە، یانیش لەوانەیە لە سەردەمی منداڵیمدا. بەڵام من لەتاو شلّەژان و نائومێدیی خۆمدا، چەندی دەمکرد و دەمکرد: نەمدەتوانی وەبیرخۆمی بهێنمەوە. هەرچۆنێک بێ، بەرامبەر ئادگاری ئەو پیرەژنە، هەستم بە کۆنە ئاشنایەتیەکی «تایبەتی» دەکرد.

پیرەژن، سەروقژ تالّ تالّ سپی؛ کۆنە برینێکی قووڵ وەک پاشماوەی گوللەیەک سەر ڕوومەتی ڕاستی چالّ کردبوو. گۆچانێکی سووری گرێ گرێی بە دەستی ڕاستییەوە گرتبوو، دەستی چەپیشی بە دەرگاکەوە.

هێواش هێواش لەناو دەرگاکە سەری هەڵبڕی. لە توێی چرچی و لۆچیی چاوە کزەکانیەوە، قەیرێک هەر تەماشای کردم. تەماشای دەکردم و بیری دەکردەوە، بێ ئەوەی هیچ هەستێکی پێشوازی پیشان بدا.

لەودەمەی کە من لەناو قووڵایی چاوەکانیدا هەوڵم دەدا بیرم بکەوێتەوە ئاخۆ من ئەم پیرەژنەم لەکوێ دیوە؛ پیرەژن یەکسەر بە دەنگێکی گازاندەبارەوە وتی:

– دارا!

دەنگی ئەو پیرەژنە زۆر لە ڕوخساری ئاشناتر، ڕایچڵەکاندم:

– ئەوە تۆی؟

من، داتۆقیو، سڵۆک، بەڵام زیاتر حەپەساو، گوتم:

– بەڵێ، دارام.

پیرەژن لە کانگای دڵییەوە بە قسە هات:

– ئەو هەموو ماوەیە لەکوێ بووی، ها؟

زۆر بە تووڕەییەوە ئەم پرسیارەی لێ کردم، بەڵام بەهیچ شێوەیەک نەیدەتوانی ئەو سۆز و خۆشەویستییەی کە لەوانەیە هەر بە زگماک هەیبوو، لەسەر ڕوخساری تووڕەبووی خۆی بیشارێتەوە.

من لە ئاست ئەم پرسیارەی ئەودا دۆش دامام، نەمدەزانی چی وەڵام بدەمەوە، لەئاکامدا گوتم:

– ببوورە ئەگەر سەغڵەتم کردبن!

هێشتا قسەکەم تەواو نەکردبوو، بە دەنگێکی توند و تووڕە یەکسەر گوتی:

– ئێستا چیت دەوێ؟

وتم: ئێرە ماڵی خاتوو ڤینۆسە؟

وتی: چیت لە ڤینۆس دەوێ؟

کە ئەمەی وت، لە خۆشیان شاگەشکە بووم. لە دڵی خۆمدا گوتم «کەواتە، خۆیەتی؛ ئەمە ماڵی ڤینۆسە». وتم:

– حەزم دەکرد چاوم پێی بکەوێ.

پیرەژن کەمێک داما، پاشان لەناکاو یەکسەڵەف لە پڕمەی گریانی دا. بە هەموو بوون و هەست و نەستی خۆیەوە، بێ ئەوەی هیچ وەڵامێک بداتەوە؛ گریان لە ناخەوە دایچڵەکاند. هەموو ئەندامەکانی لەشی لەگەڵ ئەم گریانە کەوتنە لەرزین.

من لەو دەمەدا هەستم دەکرد کە ئەو پیرەژنە دەیەوێ شتێکم تێ بگەیەنێ بەڵام نەیدەتوانی، منیش لە هەمان کاتدا دەمویست شتێکی تێ بگەیەنم بەڵام نەمدەتوانی.





وا هەستم دەکرد کە زمانێکی هاوبەشمان هەبووە و هەردووکمان ئەو زمانەمان بیرچۆتەوە، یان وەک بڵێی جیاوازییەکی زۆر کەوتبێتە نێوانمانەوە. دەیویست تێم بگەیەنێ و دەمویست تێی بگەم؛ نەماندەتوانی. دەمویست تێی بگەیەنم و دەیویست تێم بگات؛ نەماندەتوانی.

من ڕاوەستابووم و بەزەییم بەو پیرەژنەدا دەهاتەوە. لە هەمان کاتدا دەشترسام، بەڵام لە هەمووی زیاتر حەپەسابووم. لەسەر سەکۆی بەر دەرگاکەوە هەنگاوێکم هەڵنا، ویستم بچمە دیوی ژوورەوە و بیلاوێنمەوە: تێی بگەم بزانم مەسەلە چییە و چی ڕووی داوە. کەچی ئەم، لەناکاو، سەر و قژ شێواو، وەک شێت؛ پڕ بە دەنگ بەسەرما قیژاندی:

– نا!

من هەترەشم چوو. پێم تێک ئاڵا. یەکسەر کشامەوە.

– نەیەیتە ژوورەوە!

کەوتمە سەرسەکۆی دەرگاکە.

پیرەژن، گۆچانە سوورە خوارەکەی ڕووەو سنگم، بەدەم گریانەوە، هەر دەیقیژاند:

– نەیەیتە ژوورەوە...

من لەسەر سەکۆکە، لە شوێنی خۆمدا، چاو ئەبڵەق ماو، خەریک بوو لەنێوان شەپۆلەکانی هەستی نیگەرانی و سامناکیی خۆمدا، ببوورێمەوە؛ نەمدەزانی چی بڵێم. بەپەشۆکاوییەوە وتم:

– ڤینۆس لێرە نییە؟

دەمی کەفی کردبوو. ئەم جارە زۆر توندتر زریکاندی:

– نەخێر!

پاشان (هەستم کرد کە هیلاک بووە) هەر بەدەم هەستی تووڕەیی و هەنسکدانی خۆیەوە، پچڕ پچڕ، کەوتەوە گازاندە:

– دووای ئەو هەموو ساڵە، دەتەوێ هێشتا هەر چاوەڕێت بکا؟

هەر دوو دەستی لەرزۆکی بەسەر گۆچانەکە داگرتبوو، هۆن هۆن فرمێسکی دادەباراند.

من تێ نەدەگەیشتم ئەو پیرەژنە بۆچی دەگری؟ ئایا ئەو پیرەژنە چیی ڤینۆس بوو؟ دایکی، داپیری؟ نازانم. پاشان، ئاخۆ ڤینۆس چیی بەسەر هاتووە؟ سەیرە! چما چەند وەخت بەسەر دوواپین یەکتر بینینی من و ڤینۆس تیپەڕیبوو؟ بە هەمووی مانگێک نابێ. کەواتە، نابێ ئەو ڤینۆسەی ئەو باسی دەکا هەمان ڤینۆسی من بێ! سەیرە! پاشان ئەگەر پەیوەندییەک لەنێوان ئەم پیرەژن و ڤینۆس نەبێ، چۆن ئەو پیرەژنە ناوی من دەزانێ؟ سەیرە! چۆن من دەناسێ؟

پێم گوت:

– ببووره.. من دەمەوێ تەنیا لەوە تێ بگەم: تۆ بۆچی دەگریت؟

دیسانەوە گۆچانە خوارە گرێ گرێیەکەی بەرەو ڕووم بەرز کردەوە، قیژاندی بەسەرما:

– بچۆ لە دایکت بپرسە، لە خوشکەکانت بپرسە..

کە وای گوت، من بیرم بۆ ئەوە چوو کە ئەو پیرەژنە شێت بێت، بەڵام نەمدەتوانی خۆم دڵنیا بکەم، گوتم:

–.. چی؟ چۆن!

– با ئەوان پێت بڵێن!

ئینجا دەرگاکەی گرت و قیژاندی بەسەرما:

– تەواو.

بەدەم دەرگا داخستنەوەی بە ڕووما، تفێکی لێ کردم:

– جارێکی دیکە ڕوو نەکەیتەوە ئێرە!

توند دەرگاکەی لە ڕووم داخست. منیش لە بەردەم دەرگا، شانم دایە پاڵ دیوارە ساردەکە. خەریک بوو هەرەس بێنم. هەستم دەکرد چۆکەکانم دەلەرزین. شانم وردە وردە بە دیوارەکەدا داخزایە خوارەوە، لەسەر ئەژنۆی چەپمدا خەریک بوو چۆک دابدەم. وەک ئەوەی لە خەونێکی سامناک بێدار بووبێتمەوە، بە هەر دوو دەستم کەپۆڵی خۆمم ڕاگرتبوو؛ حەپەساو، سەرسام، نەمدەتوانی بیر لە هیچ شتێک بکەمەوە: تەنیا ڤینۆس نەبێ...

## 12

نیوەڕۆ، دڵ پڕ لە حەژمەت و نسکۆ، سەرگەردان، وەک ئەسپی قەرەج کە خاوەنەکەی خۆی بزر کردبێ، لەناو بازاڕی شاری سانتیاگۆ – کە خۆی بۆ سەردان و وتارە مێژووییەکەی پاپا ڕازاندبۆوە– من بە تاقی تەنیا، بێکەس، دەستم لەناو گیرفانی پاڵتۆ، غەریب، غەمگین، دەڕۆیشتم و چاوم بە خەڵک و دەوروبەری خۆمدا دەگێڕا.. بیرم دەکردەوە: چی بکەم! بۆ کوێ بچم؟ لە کێ بپرسم؟ لەکوێ بگەڕێم؟

هەرکە بیرم لە ڤینۆس دەکردەوە، یەکسەر دیمەنی پیرەژنەکە دەهاتەوە پێش چاوم و زاڵ دەبوو بەسەر مێشکمدا. هەر کاتێکیش دیمەنی بەر دەرگا و پیرەژنەکەم دەهاتەوە پێش چاو، لە خۆمەوە هەستم دەکرد: من دەبێ سیحرێکم لێ کرابێ؛ خۆم وا دەهاتە پێش چاو کە لەناو خەونێکی خۆمدا بم.

من بەتەواوەتی دڵنیا بووم کە ئەو ماڵە ماڵی ڤینۆس بوو، بەڵام سەیرە، ئەو پیرەژنە





چییە؟ بۆچی ڤینۆس خۆی نەهات دەرگام لێ بکاتەوە، یان بەلای کەمییەوە بێت وەڵامم بداتەوە! ئەو پیرێژنە کێ بوو! چیی ئەو بوو؟ بۆچی نەیهێشت چاوم بە ڤینۆس بکەوێ؟ تۆ بڵێی دایکی بێت، داپیری؟ نازانم! بەڵام هەرکێیەک بێت، هەر چییەکی ئەو بێت، بۆچی نەیهێشت بیبینم؟ لە هەمووی سەیرتر، بۆچی پێی وتم «ئەو هەموو ماوەیە لەکوێ بووی؟ سەیرە! بەڵام بەڕاستیش، ئەو پیرەژنە زۆر لەوە دەچوو شێت بێ. بە ئادگار و دیمەنی خۆیەوە بەتەواوەتی لە شێتێک دەچوو. ئاخر پیرەژنێکی شێت لە ماڵی ئەوان چ دەکا؟ ڤینۆس هەرگیز باسی ئەوەی بۆ نەدەکردم کە پیرێژنێکی شێت لە ماڵەکەیاندا هەبێ!». هەر چۆنێک بێ، ئەو پیرەژنە تاقە کەسێکە کە بزانێ ڤینۆس لەکوێیە و بتوانێ پێم بڵێ چارەنووسی ڤینۆس چییە؟

نائومێدییەکی کوشندە دڵی ڕنەک دەدام. پرسیار لە کێ بکەم؟ لەکوێ بگەڕێم! چۆن بتوانم ڤینۆس، ئەو فریشتە نازەنین و خۆشەویستەی خۆم بدۆزمەوە؟ چۆن!

پارەی خواردنی چێشتخانەکەم دا و هەڵسام، چوومە دەرەوە. لەپێش دەرگای چێشتخانەکە ئێستێکم کرد و چاوم بە دەوروبەری خۆمدا گێڕا؛ نەمدەزانی لەکوێی شارەکەم! دیسان چوومەوە ژوورەوە، لە خاوەنی چێشتخانەکەم پرسی:

– زەحمەت نەبێ؛ من لە کوێم؟

پێش ئەوەی بهێڵم کابرای خاوەن چێشتخانەکە هەست بە ناماقووڵیی پرسیارەکەم بکات؛ پرسیارەکەی خۆمم ڕاست کردەوە:

– ببوورە، مەبەستم: من لەکوێی سانتیاگۆم؟

– یەعنی چۆن؟

– کاتێدرالّی سانتیاگۆ لەکوێیە؟

دەستی بۆ لای ڕاست درێژ کرد، وتی:

– سێیەم جادە بەدەستە ڕاست بسووڕێوە..

– بەڵێ..

– پاشان ڕێک بڕۆ، ئیتر لەوێ لووتکەی کاتێدراڵەکە بەدەستە چەپ دەردەکەوێ.

لە نیوەی ڕێگا بووم، ئاوڕم دایەوە: بە دەستە ڕاستما، لە دوورەوە، باغێکی گەورەم کەوتە بەرچاو. باغێکی تابڵێیی قەشەنگ و خۆش دیاربوو. پەشیمان بوومەوە لەوەی بچمە لای کاتێدراڵەکە. لە دڵی خۆمدا گوتم «لەوانەیە ڤینۆس بەرێکەوت هاتبێتە ئەو باغە و لەوێ ببینینم!». «بۆ نا؟».

هەنگاوم هەڵنا بەرەو باغەکە چووم. لێی نووسرابوو (باغی فریشتان ) هەمان ئەو باغەی ڤینۆس باسی دەکرد.

باغەکە، جگە لەو دەرگایەی کە من دەمویست لێیەوە بچمە ژوورەوە، دەرگایەکی

دیکەشی لەوبەرەوە هەبوو کە دەیڕوانییە نیوە مەیدانێکی ڕازاوەی بە گوڵ و گوڵزار، کە لەوێشەوە شەقامێکی ئاپوورەی پڕ لە خەڵکی لێوە هەڵدەکشا بەرەو سەرەوە.

ئەملا و ئەولای شەقامەکە، هەمووی هەر قاوەخانە و باڕ بوون، بەردەرگاکانیان وێڕای سەر شۆستە، کورسی و مێزیان تێدا ریز کرابوو. خەڵکی ئەو ناوە، کە دیار بوو زۆربەی زۆریان توورێست و گەڕیدە بوون، جووت جووت، کۆمەڵ کۆمەڵ، لەبەر هەتاوی سەر شۆستە، بەدیار بوتڵی خواردنەوەی جۆراوجۆرەوە دانیشتبوون. دەنگە دەنگێکی زۆر لەو ناوە دەهات، بەتەواوەتی لە جەژنێکی بچووک دەچوو.

لە بەردەرگای باغەکە ڕاوەستابووم، تەماشای ئەو ئاپوورە ڕەنگینەی بەردەم باڕ و قاوەخانەکانم دەکرد، پاشان ئاوڕێکم بۆ لای باغەکە دایەوە، وتم «با جارێ بچمە ناو ئەم باغە، پاشانیش دەچم پیاسەیەک بەناو ئەو شەقامە ئاپوورەی ئەوێدا دەکەم»، «بەڵکو ئەو ئێوارەیە بە ڕێکەوت تووشی بێم و بیبینم!». «هەبێ و نەبێ، ئەگەر ئەم ئێوارەیە بۆ پیاسە هاتبێتە ناو ئەم باغە یانیش چووبێتە شەقامەکەی ئەوبەر، دەیبینم. لەوەش دەچێ ئیتر ئەم ناوە تاقە ناوەندی قەرەباڵغی شارەکە بێ!».

لەناو باغەکە چاوم دەگێڕا و ئەم قسانەم بەخۆم دەگوت.

ماوەیەک خوار و ژووری باغەکە گەڕام. بەدەم پیاسەوە چاوم بە هەر کچێکی باڵا بەرزی قژ ڕەشی تۆخ، چاو سەوز، ناو قەد باریک بکەوتایە، دادەچڵەکام و لێی ورد دەبوومەوە. لەکۆتاییدا، دووای گەڕان و چاوگێڕانێکی زۆر، هیلاک بووم، دڵسارد، لەسەر نزیکترین کورسیی لای خۆم دانیشتم. ئاهێکی ماندووی حەسرەتاویم هەڵکێشا، وتم:

– دەترسم هەفتەیەکی دیکەش هەر ئاوها لەم شارە نامۆ و نائاشنایەدا هەر بگەڕێم و چاو بگێڕم، بێ هیچ ئەنجامێک!

لەناکاو بڕیارم دا یەکسەر بچمە ماڵەوە، بچم پرسیار لە مادام کارلۆس بکەم. پاشان، هەر لە شوێنی خۆم لەسەر کورسیەکە بیرم کردەوە وتم «بەڵام چیی پێ بڵێم؟»، «سۆراغی کێی لێ بکەم! چۆن؟ خۆ من لە ناوی ڤینۆس – خۆی و باوکی زیاتر لەگەڵ ناونیشانەکەی، هیچی دیکە لەبارەی ڤینۆس نازانم! چی بە مەدام کارلۆس بڵێم؟».

لەوانەیە ئەوکاتە مەدام کارلۆس، کونجکۆڵانە یەکسەر گومانێکی لەلا دروست بێت. ئەو ڕۆژە لێمی پرسی: «تۆ بۆچی لە پاریسەوە هاتوویتەتە ئێرە؟ ئاخۆ ئەم جارەیان ئایا باشتر وا نییە ڕاست و ڕەوان پێیی بڵێم کە بۆ لای کچێک هاتووم! بۆ لای ئەو کچەی کە تا ئێستاش هەر نەمدۆزیوەتەوە و هێشتا لە ناونیشانەکەی دەگەڕێم؟ نەء. وای پێ ناڵێم، چونکە ئیتر ئەوکاتە دەبێ لە نووکەوە ئەو چیرۆکەشی بۆ بگێڕمەوە کە لە بەردەرگای ماڵەکەیاندا لەگەڵ پیرەژنەکە بەسەرم هات، پێویستە باسی ئەوەشی بۆ بکەم کە تاکو ئێستا دوو جاران چوومەتە ماڵەکەیان و ئاوهای پێ وتووم. نەء. وا باشترە





پێیی بڵێم کە من نیگارکێشم و لە پاریس دەژیم؛ زانیومە کە پاپا دێتە ئەم شارە و ئیتر شارەکە گەڕیدە و توریستێکی زۆری تێ دەڕژێ، هاتووم بۆ ئێرە: هەم بە سەفەر و هەم بۆئەوەی پۆرترێت بۆ خەڵکی توورێست دروست بکەم و کەمێک پارەم دەست بکەوێت. یانیش دەڵێم: کاتێ لە پاریس بووم زانیم کە پاپا لە ١٨ و ١٩ی ئەم مانگەدا سەر لە سانتیاگۆ دەدات، ئیتر منیش وەک ئەو هەموو خەڵکە، کە لە سەرتاسەری وڵاتانی ئەورووپاوە هاتوون، هاتووم بۆئەوەی لە کاتێدراڵەکەی سانتیاگۆ گوێ لە قسە و فەرمایشتە ئاینییەکانی پاپا ڕابگرم. وا باشترە قسەکانی خۆم ڕاست بکەمەوە. ئا. پێویستە هەر ئاوها بە مەدام کارلۆس بڵێم. بەڵێ. دووای ئەوەش ئیتر یەکسەر ستاند و بۆرد و کەلوپەلەکانی نیگارکێشان بە پشتم دادەم و دێمە دەرەوە، دەچمە بەردەم کاتێدراڵەکە: ستاند و بۆردەکەم لەوێ، لە بەردەم کاتێدراڵەکە هەڵدەدەم و پۆرترێت بۆ خەڵک، بۆ توورێست و گەڕیدەکان دروست دەکەم. ئیتر لەوێ، تا خۆر کەوتنان، بەدەم پۆرترێت دروستکردنەوە کات بەسەر دەبەم و چاوەڕێ دەکەم، بەشکو ئیتر لەناکاو ڤینۆس بەڕێکەوت بەوێدا تێپەڕ ببێت و ببینێ! دڵنیام هەر سەر لەوێ دەدات و دەیبینم. خۆ ئەگەر ئەم ئێوارەیەش نەیبینم، ئەوا شەو دیسان دەچمەوە بەردەرگاکەیان، لە زەنگی دەرگاکەیان دەدەمەوە. ناشێ دیسان پیرەژنەکە بێت دەرگاکەم لێ بکاتەوە! خۆ ئەگەر دیسان هەر لەوێ نەبوو، ئەوا ئیتر بەدەم پیاسەکردنەوە دەچم هەرچی باڕ و مەیخانە و دیسکۆتیک و مەیخانە هەیە، یەک یەک هەمووی دەگەڕێم، چاو بە هەموویاندا دەگێڕم.. ئەمشەو، سبەی، دوو سبەی.. هەر دەگەڕێم؛ تا دەیدۆزمەوە!

خەریک بوو خۆشی و ئومێدێکم بە دڵدا دەگەڕایەوە. هەڵسامەوە سەر پێ: بە نیازی ئەوەی کە لەسەرەتادا بچمەوە ماڵەوە و مەدام کارلۆس ببینم. لە دڵی خۆمدا گوتم:

– سانتیاگۆ جێ ناهێڵم. هەر دەبێ ڤینۆس بدۆزمەوە.

## 13

– ئەم خانووە.. شوومە.

لالۆ، پیاوێکی ڕدێن ماش و برنجی؛ ئێوارە درەنگ، لە مەیدانی بەردەم کاتێدراڵەکە یەکترمان ناسی. من دانیشتبووم پۆرترێتم بۆ ئافرەتێک دروست دەکرد؛ هات داوای لێم کرد پۆرترێتێک بۆ ئەویش دروست بکەم. بەدەم پۆرترێت دروستکردنەوە کەوتینە قسەکردن و وردە وردە لەوە دەچوو بتوانین لەگەڵ یەکتر ببینە برادەر. لەکۆتاییدا من دەسهەقی پۆرترێتەکەم لێیی نەسەند، ئەویش داخوازیی لێم کرد کە ئەم ئێوارەیە بمباتە بارێکی خۆشی سانتیاگۆ و دەعوەتی ئەو بم! پێم خۆش بوو. چووم.

لالۆ ئادگارێکی شێوەی هیندییە سوورەکانی هەبوو، بەڵام بە بنەچە (ئەندەلووسی) بوو. دەیگوت «دوکانێکی ئەنتیکفرۆشیم هەیە لەلای خەستەخانە کۆنەکەی شار.

نەخشەی جوگرافی و پۆستکارت و تابلۆی دێرین و وێنەی کۆن و شتی ئەنتیک.. بە هەرزان دەکڕم و بە پارەیەکی باش دەیانفرۆشمەوە تووریست و پسپۆڕەکان».

– کەواتە، سەبارەت بە کارەکەت، دەبێ سەفەر و هاتوچۆ زۆر بکەی؟

– بەڵێ. ئەمسەر تا ئەوسەری ئەورووپا بۆ کارەکەی خۆم تەی دەکەم. جاری وا هەیە وێنەیەک یان نەخشەیەکی جوگرافی کە لە ڤاتیگان دەیکڕم، لە هەمان ڕۆژدا هەر لە ئەوێش دەیفرۆشمەوە؛ هەندێ جاریش پۆستکارتێک یان تابلۆیەکی کۆنی لویسی چواردەهەم لە لشبۆنە دەکڕم، بە پارەیەکی زۆر باش بە شەیدایەکی ئەو پاشا فەرەنسییە لە ڕۆتردام دەیفرۆشمەوە. ئیدی ئاوها... دەگەڕێم.

– تووریست زۆر دێنە سانتیاگۆ؟

– خراپ نییە.

– زۆرتر لەوانەیە بۆ بینینی کاتێدراڵەکە بێن؟

– هەروەها بۆ بینینی خەستەخانە شاهانەکەی ئێگاس و ئەو زانکۆیەش کە لە سەدەی شازدەهەمەوە لێرە دروستکراوە. پاشان کەنارە جوانەکانی ئەتڵەنتیک و ڤیگۆ و لاکۆرۆنیاش لێرەوە دوور نین.

– کەرەستەی ئەنتیک زۆرتر لەکوێ پەیدا دەکەی؟

– لە هەموو شوێنێک. بەڵام بۆ کڕین و پەیداکردن زۆرتر دەچمە پۆرتوگاڵ و هۆڵەندا. پێرێ لە ئەمستردام گەڕاومەتەوە.

– کەرەستەی ئەنتیک و کۆنیان زۆر لێیە؟

– بەڵێ، چونکە پۆرتوگاڵی و هۆڵەندییەکان هەر لە کۆنەوە بە دنیادا زۆر گەڕاون. ئێستاش ناوماڵ و زانکۆ و تەنانەت دوکانە توحفەفرۆشەکانیشیان ئەنتیکەخانەیەکن بۆ خۆیان.

من ئەو ڕۆحە سەرکێش و گەڕیدەییەی لالۆم خۆش دەویست؛ بە زەردەخەنەیەکەوە پێم گوت:

– لە کۆتاییشدا هەر دەگەڕێیتەوە ئێرە.

لالۆ، کڵاوێکی شێوەی کڵاوی ڤیکینگەکانی لەسەر بوو. لەو وەختەوەی بینیبووم و پێکەوە بووین، ئەو کڵاوەی هەر دانەکەندبوو. کە ئەم قسەیەم کرد، یەکسەر پێکەنی و کڵاوە ڤیکینگییەکەی داکەند، لەسەر مێزەکەی بەردەم خۆی دانا و گوتی:

– بەڵێ. هەموو ئێوارەیەک دێم لێرە، لەم بارە تاریکە سەری خۆم گەرم دەکەم.

بارێکی جوانی خۆش بوو، لە ژێرزەمینێکدا.

لەو کاتەی لالۆ گارسۆنەکەی بانگ کرد و دووەم بوتڵە شەرابی بۆ هەردووکمان داوا





کرد، من پێشتر هەموو چیرۆکەکەم بۆ لالۆ گێڕابۆوە. لالۆ دیسان جەختیی لەسەر قسەکەی خۆی کردەوە:

– ئەم خانووە، شوومە.. شووم!

ئنجا درێژەی پێدا گوتی:

– بە گوێی مامی خۆت دەکەی، جارێکی دیکە هەرگیز لە زەنگی ئەو دەرگایە نادەیتەوە!

من وەک منداڵێک لە دایکی خۆی بزر بووبێ، سەرگەردان، خەریک بوو بگریم. لالۆش بە ئاوازێکی پڕ لاواندنەوە، ئامۆژگاریی دەکردم:

– ناوبانگی شوومیی ئەم خانووە نەک هەر تەنیا لە گەڕەکی ئێمە، بەڵکو لە هەموو سانتیاگۆ ئاشکرایە.

بێ ئەوەی بمەوێ، لە لالۆم پرسی:

– تۆ چەند ساڵە لەم شارە دەژیت؟

– پەنجا و یەک ساڵە. هەموو خەڵکی ئێرە چیرۆکی ئەفسووناویی ئەم خانووە دەزانن. تەنانەت وای لێ هاتووە کە خەڵک، کاتێ گەنجی وەکو تۆ دێن و دەپرسن «ئەرێ فلان ماڵ بۆ لەوێ نین و فلان کەس لەکوێیە؟» ئیتر وەڵامیان نادەنەوە؛ چونکە دەزانن ئیتر ئەو گەنجە خۆی لەکۆتاییدا ماندوو دەبێت و دەگەڕێتەوە ئەو شوێنەی لێوە هاتووە.

لە دڵی خۆمدا دەمگوت:

– بەڵام من لە خۆمەوە نەهاتووم. ڤینۆس پێی گوتووم بێم بۆ ئێرە. پەیوەندیی من بەم حەکایەتەوە چییە؟

– زۆر کەس واتێدەگەن کە ئەم خانووە ئەجندەی لێ بێت، یان هیچ نەبێ سیحری لێ کرابێ!

من کاتی خۆی کە لە هەڵەبجە مێردمنداڵ بووم، زۆر لەم جۆرە قسانەم لە پیر و پیرەژنەکانی لای خۆمان بیستبوو کە فلانە شوێن ئەجندەی لێیە و فیسارە ماڵ سیحری لێ کراوە؛ ئەمە یەکەم جار بوو – لەوەتەی لە ئەورووپا بووم – ئەم جۆرە قسانە ببیستمەوە؛ زۆرم لەلا سەیر بوو!

– هەندێ کەسی دیکەش پێیان وایە کە ئەم پیرەژنە – خۆی، سیحرباز بێ.

من واقم وڕمابوو؛ بیرم دەکردەوە:

– سەیرە!

لالۆ زۆر بە بایەخەوە بۆ دڵ و عەقڵم دەدووا:

– پێم بڵێ، ئەمە چەندەمین جارە تۆ دەچیتە بەردەرگای ئەو ماڵە؟

من فریای تێگەیشتن لە قسەکانی لالۆ نەدەکەوتم، وتم:

–دووەمین جارە.

– خەڵک دەڵێن تەنیا لە سێیەمین جاری لە دەرگاداندا ڕێگات دەدا بچیتە ژوورەوە.

– بۆ؟

– کە دەشچیتە ژوورەوە، ئیتر نایەیتەوە دەرەوە.

– نایەیتە دەرەوە؟

– خەڵک وا دەڵێن.

من سەرم سوڕما بوو، نەمدەتوانی باوەڕ بەم قسانە بێنم:

–ئەمە خورافاتە. چۆن؟

لالۆ، هەر لە سەرەتای ئەم باسەوە، هەستم دەکرد دەیەوێ ئامۆژگاریم بکا:

– من خۆم دیومە: نیوەشەوان، سیسارک و داڵی برسی، پۆل پۆل هاتوون، ماوەیەک بەسەر خانووەکەدا سووڕاونەتەوە، پاشان بە قیڕەقیڕی سامناکی خۆیانەوە دابەزیونەتە ناو حەوشەکە؛ کەلاکی بۆگەنبووی ناو ماڵەکەیان هەڵگرتووە و لە ئاسمانەوە فڕێیان داوەتەوە ناو حەوشەکە!

– تۆ خۆت ئەمەت دیوە؟

– بەڵێ. من خۆم ئەمەم دیوە.

– بە شەو؟

– بەڵێ بە شەو. نیوەشەوێک درەنگ لەم بارەوە هەستابووم و بەوێدا تێپەڕبووم، بە چاوی خۆم ئەمەم بینی.

– پۆلیس قەت نەچۆتە ئەم ماڵە و سۆراغی ئەم دیاردەیە بکا؟

– پۆلیس گاڵتەیان بەم قسانە دێت!

– بۆچی؟

– پۆلیس دەڵێن «خورافاتە»!

– چۆن خورافاتە.

– باوەڕناکەن؛ دەڵێن خورافاتە.

– هیچ قسەیان لەگەڵ ئەم پیرەژنە نەکردووە؟

– کێ؟

– پۆلیس.





– با، چۆن! پۆلیس دەڵێ: پیرەژنێکی بەستەزمانە و لە ماڵی خۆی دانیشتووە...

– من پێم گوتیت: «تفی لە من کرد». بە منی گوت: «جارێکی دیکە نەیەیتەوە بەر ئەم دەرگایە».

– پۆلیس دەڵێ: پیرەژنێکی بەستەزمانە و خەڵک وازی لێ ناهێنن. ئاوها وەکو تۆ و ئێستا...

– من جیام، لالۆ.. من جیام.

– ئێستا تۆ بۆچی وازی لێ ناهێنێ؟

– من بانگ کراوم. من کەسێک دەعوەتی ئەوێی کردووم و ناونیشانی ئەوێی پێ داوم.

لالۆ لاسمێڵی خۆی بادەدا و پێدەکەنی:

– هەموو ئەوانەی لە دەرگای ئەو پیرەژنە دەدەن؛ هەمان ئەم قسانەی تۆ دەکەن.

– پاشان من چ پەیوەندییەکم بەم پیرەژنەوە هەیە؟

– با!

– چۆن؟

– تۆ گەنجی. جگە لەمەش تۆ هونەرمەندیت. پیاوێکی دڵناسک و عاشقیت..

– یەعنی چی؟

– یەعنی، وەکو پێم گوتی: دەڵێن «ئەم پیرەژنە.. سیحربازە»، «دێتە خەونت». گەنج و هونەرمەند و عاشقی وەکو تۆ، هەمیشە، ئاسانتر و زووتر دەکەونە داوی وەهم و سیحر و جوانییەوە.

لالۆ هەر دەتگوت کۆنە سیحرباز و جادووگەرێکە لەگەڵم دەدوێ، لێمی پرسی:

– پێم بڵێ: تۆ، حەشیشە دەکێشی؟

– جار بە جار.

– تەنیا یەک جاریش حەشیشەت کێشابێت بەسە بۆ ئەوەی تووشی وەهمێک هاتبیت کە واتێبگەی عاشق بوویتە.

ئەم قسانەی لالۆ، لەناکاو، خستمیە گومانێکی قووڵەوە. وای لێکردم بە هەموو ئەو ساتە خۆشانەدا بچمەوە کە لە پاریس، لەگەڵ ڤینۆس، لە دەعوەتەکەی فیلیپ و پاشان لە بارەکەی مەیدانی مادلێن بەیەکەوە بەسەرمان برد! بەڵام ماقووڵ نییە: چۆن دەکرێ ئەو ساتە خۆشە جوانانە خەیاڵ بن؟ چۆن دەکرێ ئەو نەرماییە گەرمەی ڕان و بازووەکانی.. خەیاڵ بن؟ چۆن دەکرێ ئەو هەموو سەوزاییە ڕەنگینەی چاوەکانی، کە لە کاتی جودابوونەوەدا، تنۆک تنۆک بۆ من دەتکا.. تەنیا وەهمێک بن! ئەو هەموو قسە

خۆش و دڵنەوازانە!

بە خۆم گوت: پاشان ناونیشانەکەی، کە ئێستاش، بە دەستی خۆم نووسیم و لە دەفتەرەکەمدا هێشتاش ماوە. ناکرێ. نەخێر.

لالۆ پرسی:

– بیر لە چی دەکەیتەوە؟

گوتم: یەعنی تۆ وای دەبینی کە من بەدەم حەشیشەکێشانەوە ئەو کچەم دیبێ؟

– بە دووری نازانم.

– بەڵام من لە هەمـوو ژیانمدا، هیـچ سـاتێکی ژیانم، هێندەی ئەو چەند سـاتانەی لەگەڵ ڤینۆس بووم، هەستم بە هێزی واقیع و جوانیی واقیع نەکردووە.

لالۆ بە زەردەخەنەیەک، زۆر بە دڵنیاییەوە گوتی:

– هەموو حەشیشەکێشێک، دووای خەوبینین، یەکسەر ئەم قسەیەی تۆ دەکا.

بە لالۆم گوت:

– باشە، ئەدی کەواتە ئەم پیرەژنە چۆن ناوی منی زانی؟ چۆن من دەناسێ؟

– لە بەردەم دەرگاکە ناوی خۆتی هێنا؟

– بەڵێ. وتی: «دارا... تۆی؟».

لالۆ یەکسەر وتی:

– دەبینی: ئەو پیرەژنە زۆر باش تۆی ناسیوەتەوە!

– مەبەستت چییە؟

لالۆ قەیرێک بێدەنگ ما، بیری دەکردەوە. پاشان کونجکۆڵانە لێمی پرسی:

– تۆ لە ژیانی خۆتدا هیچ ئەوت دیوە؛ ئەوت ناسیوە؟

– نەخێر. بەڵام ڕاستییەکەی، من دوواتر بیرم لێکردەوە: شێوە و ئادگاری ئەم پیرەژنە زۆر لە شێوە و ئادگاری ڤینۆس دەچێ. ئەم پیرەژنە هەر دەتگوت ڤینۆسە و پیر بووە!

لالۆ پەنجەی شایەتمانی بەرز کردەوە و وەک ئەوەی نهێنییەکی دۆزیبێتەوە:

– ئێستا تێگەیشتیت؟ ئەم پیرەژنە هاتۆتە خەونت و خۆی لە شێوەی ڤینۆسدا بە تۆ پیشان داوە.

من خەریک بوو مێشکم ڕادەوەستا، بە لالۆم گوت:

– خەونی چی؟

– ئەم پیرەژنە.. سیحربازە و دەیەوێ لۆژیکێکی ژیانت لەلا ئاوەژوو بکاتەوە و





نهێنییەکی خۆیت پێ بڵێ.

– نهێنیی چی؟

– نهێنییەک کە ئەو لە ژیانی خۆیدا ئازارێکی زۆری بەدەستییەوە چەشتووە.

لە دڵی خۆمدا گوتم: «لالۆ کە ئەم هەموو دنیایە گەڕاوە، تۆ بڵێی لە دنیای سیحر و سیحربازیشدا شارەزا بێت!». لالۆ گوتی:

– ئەم پیرەژنە جادووگەرە دەیەوێ پێت بسەلمێنێ کە ئەمەیە چارەنووسی گەنجێتی: پیر دەبێ. دەیەوێ پێت بسەلمێنێ کە ئەمەیە چارەنووسی جوانی: ناشیرین دەبێ.. بەسەردەچێ.

پاشان گوتی: دەیەوێ وات لێ بکا باوەڕ بەوە بهێنی کە واقیعی جوانی و ئاسوودەیی تەنیا وەهمێکە.

– بەڵام من ڤینۆسم لە باوەش گرت، ماچم کرد. قسەم لەگەڵی دەکرد. زیاتر لە هەژدە سەعات پێکەوە بووین...

– تەواو. تەواو. تەواو بوو... ناگەڕێتەوە. ئەو ئاسوودەییە ناگەڕێتەوە؛ ئەو جوانییە نایەتەوە دەست.

من دەمویست ئەو ساتانەی لەگەڵ ڤینۆس بەسەرم بردبوون، بۆ لالۆ زندوویان پیشان بدەم:

– بەڵام ڤینۆس بەڵێنی پێدام کە یەکتر ببینینەوە، دەعوەتی ئێرەی کردم. بە هەمووی، دوو هەفتەیەک نابێ. لە پاریس بەڵێنی ئەوەی پێدام کە ئەگەر بێمە سانتیاگۆ؛ پێکەوە بژین...

لالۆ کونجکۆڵانە دیسان لێمی پرسی:

– ئەمە ئەو شەوە بوو کە حەشیشەت کێشابوو؟

– ئنجا حەشیشەکێشان پەیوەندیی بەمەوە چییە؟

– با.

– چییە؟

– تۆ خەونت دیوە.

من لە نیگەرانی و شڵەژانی خۆمدا بە لالۆم گوت:

– تۆ دەڵێی سەرخۆشیت، لالۆ!

– بۆچی؟

– من پێت دەڵێم: من ڤینۆسم لە باوەش گرت، ماچم کرد، قسەم لەگەڵی دەکرد.. زیاتر لە هەژدە سەعات پێکەوە بووین...

– هەموو ئەو ساتە خۆشانەی باسی دەکەی کە لەگەڵ ڤینۆس بەسەرت بردوون؛ لەناو وەهمێکدا بووی. بە وەهم و خەیاڵ ئەو ساتە خۆشانەی خۆتت بەسەر بردووە. لە کاتی حەشیشەکێشانەکەدا خەونت دیوە.

– یەعنی ڤینۆس وەهمە.

– بەڵێ، ڤینۆس وەهمێکە و هیچی تر.

– ئەگەر وەهم بێت، ئەم پیرەژنە چۆن دەزانێ کە پەیوەندییەک لەنێوان من و ڤینۆسدا هەبووە؟ منی چۆن ناسییەوە؟ ناوی منی چۆن دەزانی؟

لالۆ گوتی:

–ئەدی ئەگەر وەهم نەبێت، کوانێ ڤینۆس؟ ئەم پیرەژنە بۆچی نەیهێشت کە تۆ ڤینۆس ببینیتەوە؟

ڕاستییەکەی، منیش دەمویست وەڵامێک بۆ ئەم پرسیارانە بدۆزمەوە. گوتم:

– ئەم پیرەژنە لەوانەیە پێی ناخۆش بێت کە من ببینم، یان لەوانەیە غیرە بکات.

لەو دەمەدا لالۆ قاقایەکی زۆر سەیری لێ هەستا. ئەمە یەکەمین جار بوو لە ژیانمدا ببینم پیاوێکی بەناوساڵکەوتوو بەم شێوەیە پێ بکەنێ. لالۆ، لەنێوان پێکەنینەکەی خۆی و پێکی شەرابەکەی دەستی، پچڕ پچڕ، دەیویست بڵێ:

– چ.. ۆ.. ن؟

بارەکە هێندە پڕ غەوغا و ئاپوورە بوو، کەس ئاوڕی بۆ پێکەنینەکەی لالۆ نەدایەوە؛ بەڵام لەگەڵ ئەمەش من دەمویست مەبەستی خۆم بەشێوەیەکی باشتر بۆ لالۆ ڕوون بکەمەوە. لەناو دوودڵیدا گوتم:

– لەوانەیە ئەم پیرەژنە دایکی بێت، یان خوشکی گەورەی بێت. یان داپیری! چوزانم. هەر چۆنێک بێت، دەبێ ڤینۆس خۆی لەم ماوەیەدا باسی منی بۆ ئەو کردبێ. چونکە، تۆ سەیرکە؛ ئەگەر پەیوەندییەک لەنێوان ئەم پیرەژنە و ڤینۆسدا نەبێ، ئەو پیرەژنە چۆن ناوی من دەزانێ؟ چۆن من دەناسێ؟

لالۆ فرمێسکی پێکەنینە درێژخایەنەکەی خۆی سڕییەوە، تەبای هاوڕێیەک کە ساڵانێکی زۆر دڵسۆزی یەکتر بین، گوتی:

– هاوڕێی ئازیزم؛ من قسەی خۆمم کرد. تەواو.

ئنجا ویستی کلیل لە قسەکانی خۆی بدا، گوتی:

– شتێکی دیکەش هەیە.

وتم: چییە؟

لالۆ گوتی:





– پیرەژن خودی ڤینۆسە و پیر بووە...

– تۆ شێتم دەکەی! یەعنی چی؟

لالۆ گوتی:

– یەعنی: جوانی و ئاسوودەیی و گەنجێتی هەرگیز هەتا سەر نامێنێنەوە؛ لەناودەچن...

## 14

لەسەر سیسەمەکەم، وڕ و کاسی دووای خواردنەوەیەکی زۆر – کە هەرگیز ئاوها پێی ڕانەهاتبووم–، مەست و ماندووی دووای جگەرەیەکی خەستی حەشیشە؛ لەسەر پشتم ڕاکشا بووم، بەبێ ئومێدییەوە تەماشای نوقتەیەکی بچووکی بنمیچەکەم دەکرد. لەناکاو، لەودیو دیواری ژوورەکەمەوە، گوێم لە چرپە چرپێک بوو کە هەر دەتگوت لەتەنیشتمەوە قسە دەکەن:

– چاوت لێیە؟ دەنگی نەما!

ئەمە دەنگی مەدام کارلۆس بوو، کە لە هەمان نهۆمی ژوورەکەی مندا دەژیا؛ بە (مەدام تاردیۆ)ی دراوسێکەیانی دەگوت:

– ماوەیەک پێش ئێستا دەگریا. لالانەوەی ڕۆژە ڕێیەک دەڕۆیشت.

من بەبیرم نەدەهاتەوە ئاخۆ کەی بوو لە باڕی (بووڕگۆس) لەلای لالۆی تاقە هاوڕێمەوە گەڕابوومەوە ژوورەکەی خۆم. نەمدەزانی چەندی مانگە. نەمدەزانی چەند شەممەیە. نەمدەزانی کاتژمێر چەندە. نەشمدەزانی کەی بووە گریاوم؛ بەڵام ئەوەم بەباشی بەبیر دەهاتەوە کە خەڵک «گەورە و گچکەی خەڵکی سانتیاگۆ» بە چەپڵە و هوتاف و خۆشەویستییەکی زۆرەوە پاپایان بەڕێ دەکرد.

– سێ چوار ڕۆژێکە نەهاتۆتە دەرەوە.

ئەمە دەنگی مەدام کارلۆس بوو.

– یەعنی هەر نەهاتۆتە دەرەوە؟

ئەمە دەنگی مەدام تاردیۆ بوو.

– خۆی لە کونی ژوورەوە ناوە و نایەتە دەرەوە. قەت نەمدیوە بێتە دەرەوە.

– لە دەرگات نەداوە.

– بێ فایدەیە.

– چۆن؟

– تەنیا یەک جار؛ بەستر پێرێ بوو.

– گوتی چی؟

– سەری لە دەرگاکە هێنا دەرەوە و چل و پێنج هەزار پەسێنتی دامێ و گوتی: «بۆ مانگێکی تر لێرە دەمێنمەوە. ئەمەش کرێی ژوورەکە».

– دایناوە هەر لێرە بژی؟

– ئەمەی گوت و دەرگاکەی لەسەر خۆی داخستەوە. نازانم.

بەبیرم دەهاتەوە، ڕاستە: ڕۆژێک من وام بە مەدام کارلۆس گوت.

– ڕۆژێک جاسووسێکم لەسەری دانا.

مەدام کارلۆس وای گوت.

– ئێ!

– کوڕە پارچەڵەکەی مەدام لۆرەنس، ژێرێمی؛ پێم گوت: «ژێرێمی؛ ئەم پیاوە بۆ هەر چی شوێنێک ڕۆیشت و هەر چی شتێکی کرد، بۆمی بگێڕەوە!».

– ئێ؟

– ژێرێمی هاتەوە گوتی: هیچی نەکرد. پێکەنیم، گوتم: چۆن ژێرێمی؟ گوتی: کە لە ماڵ دەرچووە دەرەوە، بەدووایدا ڕۆیشتم؛ چوو ستاند و بۆردەکەی لە بەردەم کاتێدراڵەکە دانا. تا ئێوارە درەنگ هەر لەوێ مایەوە. هەر خەڵک دەهاتن و پۆرترێتی بۆ دەکردن. پاشانیش کە دنیا مەیلەوتاریک داهات، ستاند و بۆردەکەی پێچایەوە و بە بەردەم کەنیسەی سانت ژاکەوە چووە بارێک لە شەقامی (پۆنتێ ڤێدرا)، بارەکە ناوی (بوورگۆس) بوو. لێم پرسی گوتم: ژێرێمی، کەسی لەگەڵ نەبوو؟ ژێرێمی گوتی: نەخێر، بەڵام لەناو بارەکە، لەگەڵ پیاوێکی ڕدێن ماش و برنجیی کڵاو بەسەر دانیشت، دەستیان کردە شەراب خواردنەوە.

«ژێرێمی» ڕاستی بۆ مەدام کارلۆس گێڕاوەتەوە: چەندین شەو بوو، تەنانەت دوێنێ و پێریش، خووم بەم بارەوە گرتبوو؛ هەموو شەوێک، هەر لە کاتژمێر نۆی شەوەوە، کاتێ لە گەڕان بە دووای ڤینۆسدا ماندوو و بێهوودە و دڵسارد دەبووم، دەچوومە ئەو بارە؛ بەدەم خواردنەوەی چەند پێکێکی (مارتینی) و جارجار حەشیشە کێشانەوە لەگەڵ لالۆ دادەنیشتم، تا کاتژمێر یەک و دووی شەو؛ پاشانیش ئیتر هەڵدەستام، تەنیا، بێ ئومێد، بێکەس، دەگەڕامەوە ژوورەکەم.

بەبیرم دێ، دووایین جاری لالۆم بینی، لالۆ پێی گوتم:

– دارا؛ هاوڕێیەکی خۆم، کە پیاوێکی خەڵکی گەڕەکەکەیە، تەمەنی شەست ساڵێک دەبێ، دەیگوت: «دەڵێن: گۆڕستانێکی بچکۆڵە لەناو ماڵی ئەم پیرەژنە هەیە. هەر گۆڕێکی ئەو گۆڕستانە دارێکی عەنتیکەی لەسەر شین بووە. هەر دارێکیش جۆرە میوەیەکی سەیری پێوەیە». دەیگوت: «دەڵێن: هەر کەسێک ئەگەر بچێتە ناو ئەم ماڵە





و لەو میوانە بخوا، یەکسەر شێت دەبێ. هەر میوەیەکیش لەو میوانە، جۆرە شێتییەکی تایبەتی هەیە».

بە لالۆم گوت: هەموو ئەم شتانە خورافات و قسەی خەڵکن.

لالۆ بە تانووتەوە گوتی:

– بەڵێ؛ بۆ ئەوە دروستکراون کە هونەرمەند و گەنجی عاشقی وەک تۆ چیتر توخنی «جوانی» نەکەون. وا نییە؟

لالۆ کە هەمیشە دەیویست ئامۆژگاریم بکا. پێم گوت:

– هەر چۆنێک بێ، سوپاست دەکەم، لالۆ. تۆ هەمیشە دەتەوێ ئامۆژگاریم بکەیت و دڵنیاشم تۆ دەتەوێ من بەختەوەر بم؛ بەڵام من پێم وا نییە ئەو ڤینۆسەی من و ڤینۆسی پیرەژن دوو ڤینۆسی جیا بن. تەنیا یەک ڤینۆس هەیە.

– کام ڤینۆس؟

– ئەو ڤینۆسەی من بەدووایدا دەگەڕێم.

– لالۆ کە هەمیشە بە ئاواز و متمانەی سیحربازێک قسەی دەکرد، گوتی:

– ئەگەر ئەم قسەیەی تۆ چەوتیش بێت، با بڵێم: ڕاستە، قبووڵمە؛ بەڵام تۆ هەرگیزاوهەرگیز ئەم ڤینۆسەت نادۆزیتەوە.

– بۆچی؟

– چونکە تۆ ناتوانی بە ڤینۆس بگەی.

– ئەی؟

– دروستی بکە!

بە گازاندەوە بە لالۆم گوت:

– تۆ هەمیشە تانووتم لێدەدەیت کە من تەنیا بە وەهم دەتوانم بگەمە ڤینۆس.

– نەخێر، من مەبەستم ئەوەیە کە تۆ هونەرمەندیت. تەنیاش هونەرمەند دەتوانێ «ڤینۆس» دروست بکات. دروستی بکە! تۆ ناتوانی بە ڤینۆس بگەیت و بیکەیتە هی خۆت؛ تۆ تەنیا دەتوانی دروستی بکەی!

لالۆ پێکی شەرابە سوورەکەی بە دڵخۆشییەوە هەڵدا:

– من ئەم ماوەیە لەگەڵ تۆ بوومە فەیلەسووف هێندەی باسی ئەم مەسەلەیە بکەم. من ئێستا زۆر باش دەتناسم: کوڕی خۆم؛ ئەوەی تۆ بەدووایدا دەگەڕێی، تەنیا جوانییە، جوانییەکی هونەرمەندانەیە. تۆ کە هونەرمەندیت تۆ خۆت ئەو جوانییە دروست بکە!

– «ناتوانم. ناتوانم». یەک بە دەنگی خۆی هاواری دەکرد «ناتوانم. ناتوانم.

ناتوانم».

دەنگی مەدام کارلۆس بوو، بۆ مەدام تاردیۆی باس دەکرد.

– ناتوانم چی؟

دەنگی مەدام تاردیۆ بوو لە مەدام کارلۆسی پرسی.

– دەیگوت: «ناتوانم وێنەی جوانی بکێشم. ناتوانم وێنەی جوانی بکێشم»؛ «بەدەم گریانەوە هەر هاواری دەکرد».

مەدام کارلۆس ڕاستی دەکرد: من ئەو ماوەیە، پێنج شەش ڕۆژێک بوو خۆم لە ژوورەوە نابوو، نەدەچوومە دەرەوە: تەنیا ڕەسمم دەکرد. دەمویست ڕەسمی ڤینۆس بکەم، دەمویست ڕەسمی ئەو ڤینۆسە بکەم کە منی لە پاریسەوە هێنابووە سانتیاگۆ و لالۆ پێی دەگوتم «تەنیا وەهمێکی خۆتە و هیچی تر»، ئەو ڤینۆسەی کە هەستم دەکرد لە منداڵییەوە دەیناسم و خۆشیم ویستووە. ڕەسمم دەکرد و دەمدڕاندن. ڕەسمم دەکرد و دەمدڕاندن. هیچ تابلۆیەک، هیچ نیگارێک لەو نیگار و تابلۆیانەم تەنانەت ملیمەترێکیش ئەو جوانییە مەزنەیان پیشان نەدەدا کە لە خەیاڵی خۆمدا هەبوو. من چەندی دەمکرد و دەمکرد، نەمدەتوانی ئەو جوانییە دەرببڕم کە دەمەویست. هەستم دەکرد تەنانەت نیگارکێشان و هونەرەکەشم هەر فریام ناکەون. کاتێ فلچە و ستاندەکەم بەجێ دەهێشت و تابلۆکانم هەپڕوون بە هەپڕوون دەکرد، ئیتر تا سێبارەی نیوەشەوان لە باڕی بوورگۆس یان لە قاوەخانە و شەقامەکانی سانتیاگۆ دەمامەوە؛ پاشان سەرلەنوێ دەگەڕامەوە ماڵ و دیسان دەکەوتمە سەر نیگارکێشان، تا ئەوکاتەی کە ئیتر دیسان بڕستم لێ دەبڕا و بە تەواوی شل و کوت دەبووم؛ پاشان دیسان دەمدڕاندن و سەر لەنوێ دەستم پێ دەکردەوە. بە تەواوەتی وەک شێتم لێ هاتبوو. بە ڕەسمکردنیش نەبووایە هەرگیز خەوم لێ نەدەکەوت. تاقە سەبووری و ئومێدێکیشم، کە هەمیشە ئۆقرەیەکی پێ دەبەخشیم و سیچەنی پێ دەگرتم: تەنیا نیگارکێشان بوو، نیگارکێشان و بەس؛ کە ئەویش لە دڕاندن و سەرلەنوێ دەستپێکردنەوەیەکی دیکە زیاتر، هیچ ئاکامێکی دیکەی نەبوو.

– نیوەشەوێک بە هاوار هاوار و گریانی، لە خەو ڕاچڵەکیم. چووم لە پەنجەرەکەی ئەودیوەوە، بەدزییەوە تەماشایەکیم کرد، گوتم بزانم ئەو هاوار هاوارەی لە چییە و چی دەکات؟.. لەناکاو، چی ببینم!؟

مەدام کارلۆس بۆ مەدام تاردیۆی دەگێڕایەوە.

– چی دەکرد؟

– ئەوکاتەی من گەیشتمە بەر پەنجەرەکەی، دیتم یەکسەر سەتڵێکی پڕ لە بۆیەی سووری، بە هەر دوو دەستی خۆی هەڵگرت و کردی بە سەروگوێلاکی خۆیدا.. پاشان سەتڵێکی دیکەی زەرد و سەتڵێکی دیکەی شین.. هەر هاواریشی دەکرد «من ناتوانم،





من ناتوانم، من ناتوانم». ئنجا لەکۆتاییدا چووە بەر ئاوێنەی ژوورەکەی خۆی و، لەسەر یەک چۆک هەرەسی هێنا، سەروقژی خۆی دەرنییەوە و دەیکێشا بە سەری خۆیدا. دەگریا. گاڵتەی بە خۆی دەکرد. بەدەم چەمۆڵە لەخۆ گرتنەوە بۆیە ڕژاوەکانی سەر لەشی خۆی لە خۆی هەڵدەسوو. خۆی ڕەسم دەکرد.

مەدام کارلۆس ڕاستی دەکرد. من پێم سەیر بوو: ئەو ژنە چۆن تاقەتی هەبووە لەو هەموو ساتە جۆراوجۆرانە و بەم هەموو وردبینییەوە خۆی لە من مات بدا!

– شەوێکی دیکە دیسان بە دەنگی گریانێکی لەناکاوی هەستامەوە. زەندەقم چوو.

– بەستەزمانە خەونی دیوە. کوێرایی دایکت دایە؛ غەریبە؛ بەدەم خەونەوە هاواری کردووە.

دەنگی مەدام تاردیۆ بوو؛ دیار بوو بەزەیی پێمدا دەهاتەوە.

من ئەو شەوە، بە بیرمە: خەونم نەدیبوو، بەپێچەوانەوە لەو کاتەدا لە گەرمەی هوشیاری و هەستپێکردندا بووم؛ بەڵام لە گەرمەی نائومێدی و هەستی بێ توانایی خۆمدا تووشی فیگارییەکی کوشندە هاتم! قوماشی تابلۆکەم، بە چرنووک، بە ددان، بە گاز، بە چەقۆ.. جیڕ بە جیڕ کرد و هاوارم دەکرد: چونکە دیسان بینیم ئەو تابلۆیەی کردوومە هەرگیز نەیتوانیوە تەعبیر لەو جوانییە مەزن و پایەدارەی ناو خەیاڵی خۆم بکات؛ تەنانەت سانتیمەترێکیش جوانیی ئەو ڤینۆسەی دەرنەبڕیبوو کە من دیبووم.

هەر چۆنێک بێ، سەرەڕای هەموو ئەمانەش، لەو کاتانەدا، باوەڕ و خواستی هونەرمەندانەم هێندە بەهێز بوو؛ واتێدەگەیشتم ئەگەر خودی ڤینۆس لە سانتیاگۆ نەشبینمەوە، بەڵام لەئاکامدا هەر دەتوانم تابلۆیەکی ئەوتۆ دروست بکەم کە جوانیی ڤینۆس بەرجەستە بکات. ئەم باوەڕ و متمانەیە دڵی خۆش دەکردم و سەبووریی دەدایەوە.

– ئەگەر ئاوها بڕوا ئەم پیاوە ڕۆژێک شێت دەبێ.

– من شەوێک بینیم.

ئەمە دەنگی مەدام تاردیۆ بوو، درێژەی پی دا:

– من لەناو دەرگای خۆمان بووم: کاتێ دەرگاکەی کردەوە، بە بەردەم شوقەکەی ئێمەدا تێپەڕ بوو، بەسەر قالدرمەکاندا سەرکەوت: هێندە سەرخۆش بوو، قاچەکانی زەویی نەدەگرت. پیاوێکی کۆک و جوانیشە؛ دەزانی؟

– پیاوێکی کەشخەیە. بەڵێ.

ئێوارەیەک لالۆ گوتی: وەرە ناولەپت بخوێنمەوە!

گوتم: دەی.

لالۆ تەماشای ناولەپی منی دەکرد، گوتی:

– تۆ، خودی جوانیی خۆت تووشی نامۆیی و مەرگەساتی کردووی؛ دەزانی؟

وتم: چۆن، لالۆ؟

وتی: تۆ لە جوانیی پیاوانەی خۆت و کەشخەیی خۆت زۆر دڵنیایت..

– ئێ؟

– ئەمە وای لێکردووی هەست بکەیت کە هەر ئافرەتێک ئەگەر ماچێکتی پێ بەخشی، ئیتر ئەم ئافرەتە دەشێت هەموو قوربانییەکت لەپێناو بدات و تا هەتایە هەر شەیدا و دڵسۆزت بێت و تاکە ئایدیاڵت بمێنێتەوە.

– باش..

– کەچی لەکۆتاییدا دەبینی: لە چۆڵی قوڵفەدا بەجێماویت، تەنیا و کەساس! ئەو ئافرەتە بەجێت دێڵێ و جارێکی دیکە نایەتەوە بە لاتا. تۆ تەماشا دەکەی: ئەو جوانی و خۆشەویستییە زووگوزەرە لە وەهمێک زیاتر هیچی دیکە نەبووە!

– من تێبینم کردووە، مەدام کارلۆس؛ هونەرمەند زۆربەیان جوانن. دەڵێی هەر جوانییەکەیانە دەیانکاتە هونەرمەند.

ئەمە دەنگی مەدام تاردیۆ بوو.

دیار بوو مەدام تاردیۆ هاتبووە نهۆمی سێیەم، بۆلای مەدام کارلۆس.

پێم سەیر بوو: دیوارێکی ئەستوور لە نێوان ژوورەکەی من و ژوورەکەی مەدام کارلۆسدا هەبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەش چرپە چرپی ئەم دوو ژنە بەناوسالّکەوتووە، لەو دیوەوە، لەتوێی دیوارە ئەستوورەکەوە، ئەو شەوە، زۆر ئاشکرا، زۆر بەهێز لە گوێچکەمدا دەزرنگایەوە.

– مەدام سیمۆن دەیگوت: مەدام کارلۆس، سوێند بە ئینجیل دەخۆم، ئەم پیاوە کرێچییە تازەیەی تۆ شێتە!

– چۆن؟

– منیش وام پێ گوت. گوتم: چۆن؟ بۆچی شێتە؟ دەیگوت: ئەو ڕۆژە بینیومە: منداڵێکی کۆڵانەکەمانی ڕاگرتبوو، لێی دەپرسی «تۆ ماڵی ڤینۆس پێ نازانی؟»، منداڵەکەش دەیگوت «ڤینۆس کێ؟»؛ گوێم لێ بوو ئەویش گوتی «ڤینۆس، کچی دکتۆر گۆرباشۆ ئێستێبان. ماڵی لەلای کەنیسەی سانت ژاکە». شێتە. تەواو نییە. منداڵەکە هەر ڕایکرد. وابزانم ترسا.

– ئەرێ بەڕاست، لە تۆشی نەپرسیوە؟

مەدام تاردیۆ ئەم پرسیارەی لە مەدام کارلۆس کرد.

– من پێم گوت. گوتم: لە زەمانی پێش جەنگی ناوخۆدا، باوکم دەیگێڕایەوە





دەیگوت: ئەو وەختەی من گەنج بووم، لە هەمان ئەو گەڕەک و لە هەمان ئەو کۆڵانەی باسی دەکەیت، دەیانگوت کچێک هەبوو، فیعلەن، ناوی «ڤینۆس» بوو؛ کچی دکتۆر ئیستێبان؛ زۆر جوان بوو.. خەڵکی گەڕەک هەمووی باسی جوانیی ئەو ڤینۆسەیان دەکرد. بەڵام زیاتر لە حەفتا ساڵ پێش ئێستا؛ نەک ئەمڕۆ.

– من بەبیرم نایە، نازانم؛ بەڵام مەدام سیمۆنیش هەر ئەم قسەیەی تۆی دەکرد. دەیگوت: حەفتا ساڵێک پێش ئێستا؛ ڕاستە: کچی دکتۆر ئیستێبان ناوێک، ناوی ڤینۆس بووە و زۆر جوان بووە؛ ماڵیان لەلای کەنیسەکەی سانت ژاک بووە. هەموو خەڵکی سانتیاگۆ باسی جوانیی ئەو ڤینۆسەیان کردووە. خەڵکی پیر لەبیریانە. حەفتا ساڵێک پێش ئێستا، نەک ئەمڕۆ.

مەدام تاردیۆ توومەز دووای پرسیارکردنەی من، چووە پرسیاری لە مەدام سیمۆن کردووە، ئەویش وەڵامی داوەتەوە و پاشان نەشهاتووە وەڵامەکە بۆ من بگێڕێتەوە؛ کەچی ئیستا هاتووە بۆ مەدام کارلۆسی باس دەکا!

حەفتا ساڵێک پێش ئێستا، نەک ئەمڕۆ!

من لەودەمەدا بیرم لە قسەکانی مەدام کارلۆس و مەدام سیمۆن دەکردەوە. ئەم دوو ژنە لە زمانی خەڵکەوە و بەپێی بیرەوەریی باوانی خۆیان پێیان وابوو کە حەفتا ساڵێک پێش ئێستا (نەک ئەمڕۆ) کچێکی زۆر جوان بە ناوی ڤینۆس هەبووە و کچی دکتۆر ئێستیبان بووە! سەیرە، لالۆش، ئەو شەوە کە سەرخۆش ببوو، هەمان شتی پێ گوتم:

– پیرەژن خودی ڤینۆسە و پیر بووە.

هەر چەند بیرم لەم قسانەی مەدام کارلۆس و مەدام سیمۆن و لالۆ دەکردەوە و ئەو ساتە خۆش و پڕ ئاسوودەییانەم دەهێنایەوە پێش چاوی خۆم کە لەگەڵ ڤینۆس بەسەرم بردبوو؛ بۆم وەدیار دەکەوت کە ئەو ژیانە خۆشەی ڕابردووم لەگەڵ ڤینۆس (ئەگەرچی وەهم و خەیاڵێکی ئەفیوونیش بووبێت بە ڕای ئەوان) سەدان جار واقیعیتر و لۆژیکتر و ماقووڵتر بۆ باوەڕکردن دەهاتە بەرچاو، لەچاو ئەو هەموو قسە ناماقووڵ و نالۆژیک و ناواقیعییانەی ئەوان دەیانکرد. چونکە ئەم قسانەی ئەوان دەیانکرد، بە هیچ شێوەیەک نەدەچووە عەقڵەوە و لۆژیک نەبوو. ئەمە شتێکی ناماقووڵە و ناچێتە عەقڵەوە کە ڤینۆس لە ماوەیەکی هێندە کورت و کەمخایەندا ئەو هەموو گەنجێتی و جوانییەی وێران بووبێت و ئاوها پیر و پەژمورده پێشوازیم بکات! گەنجێتی و جوانی، چۆن دەبێ ئاوها زوو بەسەربچێ؟

باشە، ئەدی پیرەژنەکەی بەردەرگای ماڵی ڤینۆس، ئەدی ئەو – خۆی؛ بۆچی پێمی گوت: «ئەو هەموو ماوەیە لە کوێ بووی؟». پیرەژنەکە زۆر بە تووڕەییەوە ئەم پرسیارەی لێ کردم. بە دەنگێکی توند و تووڕەوە گوتی:

– ئێستا چیت دەوێ؟!

پیرەژن، گۆچانە سوورە خوارەکەی ڕووەو سنگم، بەدەم گریانەوە، هەر دەیقیژاند:

– دووای ئەو هەموو ساڵە، دەتەوێ هێشتا هەر چاوەڕێت بکا؟!

ئەم قسانەی پیرەژن، لە هەموو جارێکی بیرکردنەوەی پێشووم زیاتر دڵی ڕنەک دەدام؛ خەریک بوو عەقڵی لەدەست دەدام. وردە وردە دەگەیشتمە ئەو باوەڕەی کە بە خۆم بڵێم:

–لالۆ ڕاست دەکا: پیرەژن خودی ڤینۆسە و پیر بووە..

لالۆ دەیگوت:

– چونکە جوانی و ئاسوودەیی و گەنجێتی هەرگیز هەتا سەر نامێنێننەوە؛ لەناودەچن...

## 15

– ئنجا بەڕاستی ئەمە سەیر نییە؟

ئەمە دەنگی مەدام تاردیۆ بوو.

– چی؟

– تۆ لە پاریسەوە بێیت سۆراغی کچێک بکەیت کە حەفتا ساڵ پێش ئەمڕۆ ماڵیان لەلای کەنیسەکەی سانت ژاک بووبێت!؟ ئەمە شێتی نیە؟ ئەمە یەعنی چی؟ وەڵا مەدام سیمۆن هەقیەتی کە دەڵێ: ئەم کرێچییە تازەیەت شێتە.

من لە ماوەی ئەو چەند ڕۆژەدا، لەنێوان بەرداشی قسەکانی لالۆ و قسەکانی ئەم ژنانە و قسەی خەڵکی تر، هەروەها لەناو ئەو گێژاوەی نێوان وەهم و واقیعدا کە تێیدا بووم؛ وردە وردە هەستم بە شتێک دەکرد کە لە دەماغ و مێشکمدا تێک دەچوو. هەستم بە «کەمێک شێتبوون» دەکرد.

لالۆ ئەو شەوە پێی گوتم:

– کوڕی خۆم، بە گوێی من بکە! واز لەم عەشقە وەهمییەت بێنە!

من نەمدەتوانی جوانیی ڤینۆس، بەڵێنی ڤینۆس، ئەو هەموو میهرەبانی و خۆشەویستییەی کە من بینیبووم لەبیر خۆمیان ببەمەوە. دڵم توند ببوو. حەزم دەکرد وەک منداڵێک بگریم و بڵێم:

– ناتوانم.

لالۆ هەندێک لێم تووڕە بوو:

– کەواتە پۆلیس ناهەقی نییە کە دەڵێ: خەڵک خۆی واز لەم ماڵە و لەم پیرەژنە





ناهێنێ!

– بەڵام من، سەیرە؛ لالۆ، ناونیشانیم پێیە... ناونیشان.

– کێ پێی داوی؟ کێ تۆی تووشی ئەم شوێنە نەفرەتلێکراوە کردووە؟ ئەوە کێیە تۆی ڕەوانەی ئەم چڵپاوە ڕەشە کردووە؟

– فریشتەیەکە..

لالۆ دیسان تووڕە، گوتی:

– نەخێر.. ئەهریمەنێکە!

من لەو دەمەدا دڵم لە هەموو کاتێک غەمگینتر، گوتم:

– ئەگەر فریشتە بێت یان ئەهریمەن، لالۆ؛ تەنیا ئەو دەتوانێ ژیانم ئاسوودە و ڕۆحم ڕزگار و دنیام ڕووناک بکاتەوە..

هەستم کرد لالۆ دەیویست وەک باوکێک قسەم لەگەڵ بکات:

– کوڕی خۆم، تۆ ئەسڵەن خەڵکی ڕۆژهەڵاتیت.. پێم ناڵێی چی تۆی گەیاندۆتە ئەم بنی دنیایە؟ ئەمە ئەورووپایە، ڕۆڵەکەم.

هەستم دەکرد لالۆ باسی ڤینۆس یان پیرەژنەکەم بۆ دەکات:

– ئەم ئەورووپایە هەزاری وەک تۆی قووت داوە! ئەم شوێنە نەفرەتلێکراوە شێتت دەکا؛ دەتکوژێ. وازی لێ بێنە و بگەڕێوە وڵاتی خۆت!

گوتم: ئەم ماڵە! ماڵی ئەم پیرەژنە! ماڵی ڤینۆس! شێتی کردم!

لالۆ گوتی:

– ماڵی ڤینۆسی چی و ماڵی پیرەژنی چی، کوڕم؟ ئەمە ئەورووپایە! تۆ چ کارت بە نهێنی و سیحر و خەراباتەکانی ئێرەوە هەیە؟ ئەمە ئەورووپایە!

– ئەوەی ناونیشانی ئێرەی پێ داوم، خۆشی دەوێم، بەڵێنی داومەتێ...

– ئەمە ئەورووپایە، کوڕم...

– «ئێرە ئەورووپایە. چڵپاوە. درۆیە. وەهمە. ئێرە تەنیا وەهمێکە». وەک پڵنگێک لە ژوورێکدا بەسترابێتەوە و هاوار بکا، ئاوا یەک بە دەنگی خۆی هاواری دەکرد. ئیتر شێت بوون لەوە زیاتر چیی تری دەوێ، مەدام کارلۆس؟!

دەنگی مەدام کارلۆس بوو، بە مەدام تاردیۆی دەگوت.

– جنێوی بە ئەورووپا دەدا؟

– ڕۆژ لەدووای ڕۆژ زیاتر عەقڵ و هەستی خۆی لەدەست دەدا. من وا هەست دەکەم. بەتایبەتی لەم دوو ڕۆژەی دووایییدا هیچ ڕەفتارێکی بە ڕەفتاری مرۆڤێکی ئاسایی

ناچێ. دەترسم لەکۆتاییدا شێت ببێ. چەندیش خۆمی لێ مات دەدەم، قەت نەشمدیوە بێتە دەرەوە. نازانم چ وەختێک دەچێتە دەرەوە!

گوێم هەڵخستبوو بزانم مەدام تاردیۆ چی وەڵام دەداتەوە. هیچی نەوت. ئنجا مەدام کارلۆس گوتی:

– من یەکەم ڕۆژ کاتێ لە وێستگەی شەمەندەفەرەکە بینیم و کلیلی ژوورەکەم دایە، ئاوها نەبوو: پیاوێکی زۆر هێمن و ماقووڵ دیار بوو.

– منیش وا هەست دەکەم. تەنیا لەم هەفتەیەی دواییدا وای بەسەر هاتووە.

– داینابوو هەر شەوێک و دوو شەو لێرە بمێنێتەوە، ها؟

– ئاخر، پاش نیوەڕۆی ڕۆژی دووەم تەلەفۆنی بۆکردم. وتی: «مەدام کارلۆس، دوو سێ شەوی دیکەش هەر لای ئێوە دەمێنمەوە. وتم: باشە، تەلەفۆنەکەی داخست، سێ چوار سەعاتی پێ چوو، دیتم ئەمجارەیان هاتە ماڵەوە، یەکسەر بێ سێ و دوو خۆی کردە ژوورەوە، وتی: «ببوورە مەدام کارلۆس، پرسیارێکم هەیە». من شڵەژام، بەحەپەساوییەوە سەیریم دەکرد، ڕەنگی وەک پەڵکە پیواز زەرد هەڵگەڕابوو، زۆر نائارام و ماندوو دیار بوو، وتم: «فەرموو، خێرە!؟». دەفتەرێکی چکۆلانەی، بە پەلەپرووزێ لە باخەڵی خۆی دەرهێنا و لاپەڕەیەکی عەنتیکەی لەناو دەفتەرەکەی خۆیدا بۆم کردەوە پێی نیشان دام. لاپەڕەکە نازانم بە چ زمانێک نووسرابوو! ئەو پیاوە فەرەنسی نییە، تۆ دەزانی؟

– بەڕاست؟

– فەرەنسی نییە! نەء.

– بە قسەی خۆی، بە منی دەگوت کە لە پاریسەوە هاتووە.

– درۆ دەکا، لە پاریسەوە نەهاتووە، لە وڵاتێکی دیکەوە هاتووە.

– چۆن دەزانی؟

– خەت و نووسینەکەی، خەت و نووسینی فەرەنسی نەبوو. نازانم چ خەتێک بوو؟ لە خەتی عارەبی دەچوو.

– لەوانەیە عارەب بێ.

– نەء، سەر و سەکوتی بە عارەبان ناچێ. ئیدی ئەو لاپەڕە عەنتیکەیەی خستە بەردەمم. پەنجەی خستە سەر ناونیشانێک کە تەنیا هەر ئەو بە لاتینی نووسرابوو، ئەویش بە خەتێکی شەڕە پشیلەی زۆر ناخۆش، زۆر بە زەحمەت بۆم دەخوێندرایەوە.

– ناونیشانی کێ بوو؟

– منیش نازانم. پێم دەڵێ: ئەم ناونیشانە پێ نازانی؟ منیش لە ناونیشانەکە ورد بوومەوە (شەقامی پەرەدیس. خانووی ژمارە ٩). پێم وت «پێ نازانم، بەڵام ڕاوەستە،





لەوانەیە بیدۆزمەوە». چووم ڕێبەری ناونیشان و ناوی شەقامەکانی سانتیاگۆم بۆی هێنا، هێندەی گەڕام و گەڕام ئەو ناونیشانەم نەدۆزییەوە. ماوەیەک داما، پاشان لەبەر خۆیەوە ئیستێکی کرد، وتی: «نازانی ئەم ماڵە کێن؟». وتم: «کام ماڵ؟». وتی: «ئەم ماڵەی کە لەم ناونیشانەدا نووسیومە»: منیش تەماشای ناوی خاوەنماڵەکەم کرد (دکتۆر گۆرباشۆ ئێستێبان). وتم: «نەء، نایانناسم». وتی: «هەر قەت ناوت نەبیستوون؟».

– لێت نەپرسی «ئەو ماڵە کێن؟ چن؟».

– با.

– وتی: چی؟

– وتی «منیش نایانناسم».

لەو دەمەدا مەدام کارلۆس و مەدام تاردیۆ پێکەوە بە دەنگێکی زۆر بەرز دایانە قاقای پێکەنین، ئینجا مەدام کارلۆس، بەدەم پێکەنینەوە درێژەی پێدا، وتی:

– پێم دەڵێ «من تەنیا کچەکەیان دەناسم». وتم: «کام کچ»؟ وتی: «ڤینۆس». پێکەنیم، وتم: «نایناسم».

– لێت نەپرسی ئەو کچەیان چۆن دەناسی؟

مەدام تاردیۆ ئەم پرسیارەی لە مەدام کارلۆس کرد.

– با. لە سەرەتادا وتی «دەزگیرانمە» پاشان شڵەژا، وتی «نەء، تەنیا هاوڕێمە». دەڵێ «لە پاریس ناسیومە».

– لەوانەیە درۆ بکا، مەبەستی دیکەی بەو ماڵە هەبێ.

– ئینجا تۆ ڕاوەستە! لێم پرسی «ئەو کچە خۆی ئەم ناونیشانەی پێ داوی؟». وتی «ئا». وتم «ئەی چۆن نایدۆزیتەوە؟!» وتی «نایدۆزمەوە». پاشان ئیتر، هەستم پێی کرد، یەکجار شپرزە و نیگەران دیار بوو، لەناکاو دەفتەرەکەی خستەوە باخەڵی خۆی و لەبەرخۆیەوە وتی «دەچمەوە لای پیرەژنەکە». منیش چیتر نەمتوانی خۆم لەبەر ئەو دیمەنە سەیر و سەمەرەیە ڕابگرم، لە قاقای پێکەنینم دا، وتم «کام پیرەژن؟». وەڵامی نەدامەوە، وەک شێت، بەپەلە پرووزێ ڕۆیشتە دەرەوە.

– سەیرە!

– تەواو نییە، نەء.

– بە منی دەگوت «هاتووم لێرە سەر لە هەڤاڵێکم بدەم».

– کەچی بە منیشی دەگوت «هاتووم لێرە پۆرترێت بۆ خەڵک دروست بکەم و پارەیەکم دەست بکەوێ».

– ژوورەکەی پڕ کردووە لە بۆرد و ستاند و پاستیل و ڕەنگ و کارتۆن و قوماش و زەیت و تابلۆی پارچە پارچە کراو. عەینەن ژووری شێتانە.

– بەڵام درۆ دەکا: بۆ پۆرترێت و پارە پەیداکردن نەهاتووە بۆ ئێرە، هەر بۆ ئەو کچە هاتووە. عاشقە.

مەدام کارلۆس ئەمەی گوت.

پاشان گوێم لە مەدام تاردیۆ بوو، گوتی:

– مەدام کارلۆس، من پێم وابێ: هونەرمەند و نیگارکێش و ئەم جۆرە پیاوانە.. هەموویان هەروا شێت و پێتن.

– ئەو ڕۆژە دەیگوت: شەو لە باڕی کۆڵۆمبیەکاندا جانتای پارەیان لێ دزیوم.

– بەڕاست!

– بەڵێ. دەیگوت (٤٠٠٠٠) پەسێنتی تێدا بووە.

– لەوانەیە ڕاست بکا. پیاوێکی هەندێک خۆنەویست دیارە.

– نەء، سەرخۆش بووە، ئاگای لە خۆی نەماوە و ونی کردووە.

– بێگومان. پیاو ئەگەر سەرخۆش نەبێ، چۆن جانتای پارەی خۆی لێ ون دەبێ؟

– ڕاستیەکەت دەوێ، مەدام کارلۆس، ئەم جۆرە پیاوانە زیاتر جێگای بەزەیی هاتنەوەن نەک ڕق لێ بوونەوە.

پاشان مەدام کارلۆس گوتی:

– من وابزانم سبەینێ پێی دەڵێم کە چیتر رازی نابم ئاوها بمێنێتەوە. ئەو هەموو ناڵە و فیغان و دەنگە دەنگ و هەرایە..

– کچێ، ئاخر گوناحیشە دەری بکەی..!

– ژوورەکەی پڕ کردووە لە بۆیاغ و پارچە پەڕۆک و ڕەنگ و پارچە کارتۆنی دڕاو! هەر پارچە تابلۆیەکی دڕاو لە شوێنێک کەوتووە. ئەو ژوورەی کە بۆیم ڕێک خسبوو، کردوویەتیە شێتخانەیەکی بچووکی ڕەنگاوڕەنگ. زبڵخانەیەکە بۆ خۆی! کێ هەموو ئەمانەی لێ قبووڵ دەکا؟ سەرەڕای هەموو ئەمانەش، تاکو ئێستا من نازانم تا کەی هەر لێرە دەمێنێتەوە؟ ئەتوارێ عەنتیکە و سەیریشی هەیە؛ ئەو ڕۆژە هاتووە دەڵێ: مەدام کارلۆس، تکات لێ دەکەم، «خەریک بوو دەستم ماچ بکا» توخوا ژنێکی فاڵگرەوەم پیشان بدە! پێکەنینم پێی دەهات و بەزەییشم پێیدا دەهاتەوە: بەڕاستی گوناح دەهاتە پێش چاوم. کچێ ئاخر گەنجە و تووشی دەردی خۆی هاتووە. خۆ دیارە. وتم: چی؟! وتی: دەڵێن: «سانتیاگۆ پڕە لە ژنە قەرەجی فاڵچی و بەختگرەوە. دەمەوێ بەختی خۆم بخوێنمەوە». چی بکەم! ناردمە لای مەدام مێلاگا.





مەدام کارلۆس ڕاستی دەکرد: هەناردمی بۆ لای مەدام مێلاگای فاڵگرەوە. مەدام مێلاگا، ژنێکی ئەسمەری جوان، گۆشتن، سەری کەپووی زۆر درشت کوترابوو؛ چل و چوار کەزیەی درێژی زۆر وردی زەردی سیحربازانەی بەردابۆوە. تەشک و دامەنێکی تەواو قەرەجانەی هەبوو. ئەو جلە ڕەنگینە پەلکەزێڕینەییەی، زۆری لێ دەهات. لە هەمووی سیحراویتر چاوەکانی بوون کە وەک چاوانی هەڵۆ بەردەوام لێم ورد دەبوونەوە.

لە مەدام مێلاگام پرسی:

– من دەمەوێ ئەوە بزانم: ئایا جگە لەو پیرەژنە کەسی دیکە ئەمڕۆ لەو خانووە دەژی؟

– من پێشتر پێم وتی: نەخێر. بەڵام دەڵێن: حەفتا هەشتا ساڵێک پێش ئەمڕۆ کچێکی زۆر جوان، کچێکی زۆر بەدەو لەوێ دەژیا، دەڵێن ناوی (ڤینۆس) بووە. ئەمڕۆ ئەم کچە لەوێ نەماوە، کەس نازانێ چی بەسەر هاتووە و بۆ کوێ چووە! تەنانەت دەڵێن کە ئەم پیرەژنە بۆ خۆیشی نازانێ.

– ناڵێن ئەو پیرەژنە چیی ئەو کچە بووە؟

– هەندێ کەس دەڵێن دایکی بووە، هەندێ خەڵکی تریش دەڵێن «نا»، ئەو پیرەژنە هەمان کچەکەی هەشتا ساڵ پێش ئێستەیە.

– ئەمە چۆن دەبێ!؟

مەدام مێلاگا، داوێکی ڕەشی درێژی بە دەمەوە گرتبوو. دەستی چەپی گرتبووم و تەماشای ناولەپی دەکردم، لێمی پرسی:

– تۆ کاتێ بۆ یەکەمین جار چاوت بەم پیرەژنە کەوت، هەستت کرد کە دەیناسیت، یان پێشتر دیوتە؟ تەماشای ناو چاوم بکە!

لەو دەمەدا مەدام مێلاگا وەک هەڵۆیەک تەماشای ناو چاومی دەکرد. دووبارەی کردەوە: تەماشای ناو چاوم بکە!

گوتم: بەڵێ. تەنانەت پیرەژن بۆ خۆیشی، بێ ئەوەی هێشتا من ناوی خۆم بە ئەو بڵێم، ناومی هێنا.

مەدام مێلاگا چەپکێک لەپکە و مازی و خەناوکەی قەرەجانەی بە گەردنی خۆیەوە شۆڕکردبۆوە. لەو دەمەی کە من ئەم قسەیەم کرد، لێی ورد دەبوومەوە: تابلۆیەکی جوانی نەریمانی هاوڕێم بیرکەوتەوە کە لە پاریس بە قەد دیواری ماڵەکەی خۆیانی هەڵواسیبوو، دەیگوت: «ئەمە دایکمە».

مەدام مێلاگا گوتی:

– کوڕی خۆم، کوڕی شیرینم؛ تۆ جادووت لێ کراوە.

– بەڵام ئاخر من کچەکەم بینیوە، قسەم لەگەڵی کردووە.

– خەیاڵ بووە. لەوانەیە بە خەیاڵ غەریبیی خوشکێکی خۆت کردبێت و واتزانیبێ ئەم کچەیە.

– ماچیم کردووە، شەو و ڕۆژێک پێکەوە بووینە، پیاسەمان پێکەوە کردووە...

– تەنیا وەهمێک بووە و هیچی تر.

– چۆن؟!

– لەوانەیە کۆنە دەزگیران یان خۆشەویستێکی خۆت بووبێت و واتزانیبێ ئەم کچەیە.

– ئەدی بۆچی، چۆن ئەم ناونیشانەی ئێرەی پێ داوم؟

– هەموو ئەوکەسانەی جادوویان لێ دەکرێ یان خەونێکی ناخۆش دەبینن؛ ئەم پرسیارانە دەکەن، ڕۆڵەی شیرینم.

– سەیرە!

مەدام مێلاگا، دووبارە، ئەم جارە دەستی ڕاستی گرتم؛ کەوتە خوێندنەوەی ناولەپم:

– ئەم کچە خولقاوی بیری خۆتە. تۆ بە خەیاڵ جیهانێکی میهرەبان و ئاسوودەت لەو کچەدا بۆ خۆت دروست کردووە و هاتووی لێرەدا بە دووایدا دەگەڕێی.

من خەریک بوو لە بەرامبەر قسەکانی مەدام مێلاگا دڵم شەقی دەبرد. ئنجا لەناکاو لێمی پرسی:

– تۆ تەمەنت چەندە؟

گوتم: سی و دوو ساڵە. بۆ؟

مەدام مێلاگا بە زەردەخەنەیەکی دایکانەوە گوتی:

– تۆ هەرگیز نەدەبوایە لە کەسوکاری خۆت جیا ببیتەوە؛ بەتایبەتیش لە دایکت.

وتم: بۆ؟

مەدام مێلاگا بە پەنجەی شایەتمانی تنۆکێک کلی لە قولینچکەی چاوی چەپی خۆی دەسڕییەوە، غەمگینانە، گوتی:

– کوڕم، تۆ زۆر لەوە ناسکتری کە بتوانی لە دوورەوڵاتی و غەریبیدا بە بێکەسی و بەبێ خۆشەویستی بژیت.

پاشان وتی:

– تۆ هاتووی لێرە، بە دووای ڕابردوویەکی وندا دەگەڕێی کە لەدەستت چووە. بەدووای وەهمێکدا دەگەڕێی...

منیش لەگەڵ ئەو تەماشای ناولەپی خۆمم دەکرد:





– ئەم وەهمە چییە؟

– ماددییات نییە. سەرتاپای ڕووناکی و خێر و جوانی و سەفایە. بەڵام لەم نزیکانەی خۆت و لێرە هەرگیز دەستت ناکەوێ؛ تەنانەت لە هەموو ئەورووپاش دەستت ناکەوێ.

مەدام مێلاگا پشتەچاوە کلرێژەکانی دەتگوت پێستی ئەستووری جوانی ڕەشمارێکە. زۆر باریکبێن لە ناولەپم ورد دەبۆوە. دووای بێدەنگییەکی زۆر، گوتی:

– کوڕی خۆم.. تۆ گەلێک وڵاتانی دیکەی ئەم ئەورووپایە تەی دەکەی، گەلێک شار و ڕێگەوبانی دیکەش پەی دەکەی. لەو ڕێگەوبانە ئاوارەیەی عەوداڵبوونی خۆتدا، هیچ دوور نییە ڕۆژێک (پێش درانی پێڵاوەکانت) بە حەسرەتی «ڤینۆس» سەربنێیتەوە... ئەمەش چارەنووسی هەموو هونەرمەندێکە.

**١٩٨٩– ١٩٩١ پاریس**

***

– ئەم ڕۆمانە لە ١٩٨٩ – ١٩٩١ لە پاریس نووسراوە. لە هەولێر لە سەرەتای ٢٠٠٢ پاکنووس کراوە.

– چەند کۆپلەیەکی شیعر کە بەکارهاتوون، بە دەسکارییەوە، لە دیوانی (زەردک)ی د. ئەحمەدی مەلا وەرگیراون.

– ئەو ناوانەی لەم ڕۆمانەدا بەکارهاتوون، وەک ناوی کەسایەتییەکانی هەموو چیرۆک و نۆڤلێتێکی دیکەم، دروستکراوی خۆمن: لە واقیعدا نین، یان ئاگام لێ نییە هەبن.